


# کێشناسیی کوردی

نووسینی
عه زیز گه ردی





کتێبخانەی نارام - ڕانیه

# کێشناسیی کوردی

نووسینی

عەزیز گەردی

کتێبخانەی ئارام-ڕانیە

سوپاس بۆ د. عاتیف فەرهادی کە لە ڕێکخستنی
خشتەو هێلکاریو بازنەکان یارمەتی دام

زنجیرەی کێشناسیی:

١- کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، هەولێر، ١٩٩٩
٢- ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، سلێمانی، ٢٠٠٣
٣- کێشناسیی کوردی، بێروت، ٢٠١٣
٤- فەرهەنگی کێشناسی.
٥- چەند لێکۆڵینەوەیەکی کێشناسی.
٦- کێشی ژمارەیی کوردی.
٧- کێشی شیعر - ئاسۆیەکی فراوانتر.

# پێشەکی

کێشناسی لقێکە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی سەر بە ئەدەبیاتناسی. ئەرکی لێکۆلێنەوەی کێش‌و ئاوازی شیعرە کە رەگەزێکی گرنگی شیعر پێك دێنێ. بە هۆی زانستی کێشناسییەوە، بەشێکی کاریگەریی ویژدانیی شیعرمان بۆ دەردەکەوێ. بۆمان دەردەکەوێ ئاوازی شیعر لەگەڵ رەگەزەکانی تری شیعریدا چ جۆرە کەشێك دروست دەکەن بۆ گواستنەی هەست‌و سۆزی شاعیرو چ کارێك لە هەست‌و سۆزی خوێنەر دەکەن. ئایا ئەو ترپەو ئاوازو ئیقاعەی لە شیعرەکەدا هەستی پێ دەکرێ لە چییەوە هاتووە؟ ئایا ریزبوونی دەنگ‌و برگەی جیاواز چۆن ئاوازی شیعری جیاواز دروست دەکا؟ لێرەدا داهێنانی شیعری لە رووی ئاوازەوە لە شاعیرێکەوە بۆ شاعیرێکی تر دەگۆرێ. ئەم زانستە جگە لە لەیەك جیا کردنەوەی جۆری کێشەکان‌و هەوڵدانی بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان بابەت‌و جۆری کێشەکان، لە چوارچیوەی هەر جۆرە کێشێکیشدا، داهێنانی شاعیرێك‌و شاعیرێکی تر لە یەك جیا دەکاتەوە.

ئەرکی یەکەم‌و سەرەکی زانستی کێشناسی دەست نیشانی کردنی بنەمای کێش‌و دیاریی کردنی جۆرە جیاوازەکانی کێشە. لە هەمان کاتدا رادەی زالبوونی شاعیر بە سەر زمان‌و بە سەر ئاوازی شیعر دەست نیشان دەکاو ئەگەر شیعرێك لە رووی کێش‌و ئاوازەوە کەم‌وکورتی تێدا بێ دیاری دەکا.

شیعری کوردی بە زارگوتن‌و نووسراوی شاعیرانەوە، بە هەموو زارە جیاجیاکانەوە، هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا بە دوو رێچکەدا رۆیشتووە یان بڵێین لە سەر دوو بنەمای جیاواز دروست بووە. یەکەم: کێشی برگەیی کە لەسەر بنەمای ژمارەیی هاتووەو هەموو شیعری میللی‌و هەموو شیعری زاری گۆران،

چەند شیعرێکی کەمی لێ دەرچێ‌و شیعری نوێ کە لە بیست‌و سییەکانی سەدەی بیستەم شاعیران گەڕانەوە سەری، هەمووی بەم جۆرە کێشە نووسراوە. ئەمە کێشی کوردییە. دووەم: شیعری کلاسیکی کوردی، جگە لە شیعری زاری گۆرانی، کە لەسەر بنەمای چەندێتی هاتووە هەمووی بەو جۆرە کێشە نووسراوە کە بە کێشی عەرووزی ناسراوە. ئەم بنەمای کێشە لە عەرووزی عەرەبییەوە هاتووە جا بە شێوەیەکی راستەوخۆ بێ، یان ناراستەخۆ لە رێی شیعری فارسییەوە بێ کە ئەمەیان زیاتر رێی تێ دەچێ. ئەم جۆرە کێشە بەش بە حاڵی شیعری کوردی کێشێکی رەسەن نییە. جۆرە کێشێکی خوازراوە. شیعری کوردی ، جگە لە شیعری زاری گۆران ماوەی هەزار ساڵێك بەم کێشە نووسراوە تا لە بیست‌و سییەکانی سەدەی رابوو (سەدەی بیستەم)دا شاعیران گەڕانەوە بۆ کێشی ژمارەیی رەسەنی کوردی.

ئەم کتێبە بریتییە لە پێنج بەش:

بەشی یەکەم بۆ بنەماکانی کێش تەرخان کراوە. دوو باسە: باسی یەکەم بۆ بنەمای کێش بە گشتی. وەکوو دەنگ‌و جۆرەکانی‌و برگە‌و جۆرەکانی‌و هەندێ زاراوەی تایبەت بە کێش وەکوو چەمکی دێرە شیعر لە هەردوو جۆرە کێشداو بەشەکانی دێرە شیعرو...تەرخان کراوە. باسی دووەم بنەماکانی کێشی عەرووزی پێشکەش دەکا وەکوو پێشەکییەك بۆ چوونە ناو بەشی دووەم. ئەمە بنچینەکانی کێشی عەرووزی دەگرێتەوە وەکوو پێ (تەفعیلە)و پایە (رکن)و گۆڕانی پێیەکان (زیحاف‌و عیللە)و بازنە‌و کێشەکان.

بەشی دووەم بۆ کێشی شیعری عەرووزی لە کوردیدا تەرخان کراوە. کێشە عەرووزییە باوەکانی شیعری کوردی بە شیکردنەوەو نموونەوە پێشکەش کراوە.

دوای شیکردنەوەی هەر لقە کێشێك پێنج نموونەو دوای تەواو بوونی هەموو لقەکانی هەر کێشێك ١٥ نموونەو لە کۆتایی هەموو کێشەکانیشدا ٣٠ نموونە بۆ شیکردنەوە دراوە.

بەشی سێیەم لەو کێشانە دەکۆڵێتەوە کە لە سەر بنەمای ژمارەیی هاتوون و جۆرەکانیان دیاری دەکاو لە شیعری میللیو شیعری شاعیراندا نموونەی بۆ دێنێتەوە.

بەشی چوارەم بۆ شیعری ئازاد تەرخان کراوە. هەردوو جۆرە شیعری ئازاد: چەندیو ژمارەیی بە نموونە روون کراونەتەوە

بەشی پێنجەم لە سەروا دەدوێو سنووری سەروا لە دێرە شیعر دیاری دەکاو چۆنیەتی دابەشبوونی لە هەردوو جۆرە شیعرەکەدا روون دەکاتەوە.

لە کۆتاییدا سەرچاوەکان بە پێی هیجایی ریز کراون. ئینجا لە هەرە دواوە فەرهەنگۆکێك بۆ وشە گرانەکانی ناو شیعرە نموونەکان کراوە کە رەنگە بۆ نەوەی نوێ زەحمەت بن.

# بەشی یەکەم

## باسی یەکەم

## بنەماکانی گشتی کێشی شیعر

کێشی شیعر ئاوازەو ئاوازی شیعریش لە دەنگەوە دێ. لەگەڵ دەنگی هاوبەشی زمانەکاندا، هەر زمانەو ژمارەو هەندێ دەنگی تایبەتی خۆی هەیەو بە پێی کۆمەڵە سیستەمێکی تایبەتی کار دەکا. هەر ئەمەیشە وای کردووە کۆمەڵە بنەمایەکی جیاوازی کێشی شیعر پەیدا ببێ.

ژمارەی دەنگی هەموو زمانەکان وەکوو یەك نییە. زمان هەیە ژمارەی دەنگی زۆر کەمەو پەنا دەباتە بەر هەندێ دیاردەی دەنگسازی بۆ ئەوەی تۆڵەی کەمی دەنگەکانی بکاتەوە، هەندێ زمانیش ژمارەی دەنگەکانیان گەلێ زۆرە. لە کوردیدا، تۆژەوەرانی دەنگسازیی ژمارەی دەنگەکانیان بە دەوری سی ٣٠ دەنگێك داناوە.

### دەنگ:

وزەیەکی تیشکئامێزی میکانیکییە بە هۆی فشاری شەپۆڵی ئاسوورییەوە لە ناوەندێکی مایەکیدا (بۆ نموونە وەکوو هەوادا) دەگوازرێتەوەو هۆی بابەتیی بیستنە(فەرهەنگی وێبستەر).

لە کوردیدا وەکوو هەر زمانێکی تر دوو جۆرە دەنگی سەرەکی هەن:

١- نەبزوێن ٢- بزوێن

١ – نەبزوێن: ئەو دەنگەیە کە لە کاتی گۆ کردندا، ئەو تەوژمە هەوایەی لە سییەکانەوە دێتە دەرەوە تووشی بەربەستێکی تەواو، یان نیمچە بەربەستێك دەبێ. وەکوو: ب، پ، ت: ج، چ، ح، خ، د، ر، ڕ، ز ژ، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، ڵ، م، ن، هـ.

نەبزوێن دوو جۆرە:

ئەلف: نەبزوێنی گڕ: ئەو نەبزوێنەیە کە لە کاتی گۆ کردنیدا، ژێیەکانی دەنگ دەلەرنەوە، وەکوو: د، ڕ، ژ، ع، غ، ڤ، ق، م، گ، ل، ڵ، م، ن.

ب – نەبزوێنی کپ: ئەو نەبزوێنەیە کە لە کاتی گۆ کردنیدا، ژێیەکانی دەنگ نالەرنەوە، وەکوو: ت، پ، ك، ف، خ، هـ.

چەند ڕێگایەك بۆ لێك جیا کردنەوەی نەبزوێنی گڕو نەبزوێنی کپ هەن:

ئەلف: لە کاتی گۆ کردنی دەنگەکەدا، دوو پەنجەت بخەرە سەر گرێی گەردەنت (سێوی ئادەم). هەست پێ دەکەی داخۆ ژێیەکان دەلەرنەوە، یان نالەرنەوە؟

ب– پەنجەی هەردوو دەستت لە ناو هەردوو کونە گوێت بنێ‌و دەنگێکی گڕو دەنگێکی کپ ( بۆ نموونە وەکوو: ب، پ) بە دەنگی بەرز بڵێ، لە کاتی گۆ کردنی دەنگە گڕەکەدا (ب)، هەست دەکەی لە ناو سەرت دەنگ دەداتەوەو دەزرنگێتەوە، کەچی لە کاتی گۆ کردنی دەنگە کپەکەدا (پ)، ئەو دەنگدانەوەو زرنگانەوە نییە، دەنگەکە بە نەرمی لە زارت دێتە دەرەوە.

ج– تەڵە شخارتەیەك دابگیرسێنەو بە داگیرساوی لە لێوی خۆتی نزیك بخەرەوە. لە هەمان کاتدا، دەنگێکی گڕو دەنگێکی کپ (بۆ نموونە وەکوو: ب،

پ) بە دەنگی بەرز بڵێ. لە کاتی گۆ کردنی دەنگە گڕەکەدا، تەڵە شخارتەکە ناکوژێتەوە، بەڵام لە کاتی گۆ کردنی دەنگە کپەکەدا، تەڵە شخارتەکە دەکوژێتەوە.

٢- بزوێن: ئەو دەنگەیە کە لە کاتی گۆ کردندا، ئەو تەوژمە هەوایەی لە سییەکانەوە دێتە دەرەوە تووشی هیچ بەربەستێك نابێ, وەکوو: ا، ە، و، وو، ۆ، ی، ێ ( هەندێ نووسەر - یی و وێ- یش بە دوو بزوێن دادەنێن).

تێبینی:

هەموو بزوێنەکان دەنگی گڕن.

چەند سەرنجێك:

ئەلف - جگە لە جۆری کێشی شیعر، جۆری ئەو دەنگانە دەوری خۆیان لە دروست کردنی ئاوازی جیا جیای شیعرەکە هەیە. دوو شیعر وەربگرە هەردووکیان لە سەر یەك کێش بن، سەیر دەکەی ئاوازیان جیایە. جیاوازیی ئاوازەکە لە جیاوازیی جۆری دەنگەکانەوە هاتووە.

ب - ئەگەر شیعرەکە دەنگی نەبزوێنی گڕی زۆر تێدابێ، کە دەنگێکی رەق و توندە، ئاوازەکەی بە لای رەقی و توندیدا دەشکێتەوە، خۆ ئەگەر دەنگی نەبزوێنی کپی زۆر تێدا بێ، کە دەنگێکی نەرم و هێمنە، ئاوازەکە بە لای نەرمیدا دەشکێتەوە.

ج - ئەگەر شیعرەکە دەنگی بزوێنی درێژی زۆر تێدا بێ، کە ماوەیەکی زەمەنی زیاتری لە دەنگی بزوێنی کورت دەوێ، ئاوازی شیعرەکە بەرەو خاوبوونەوەو هێدی بوون دەچێ خۆ ئەگەر شیعرەکە دەنگی بزوێنی کورتی زۆر تێدا بێ، کە ماوەیەکی کەمی بۆ دەربڕین دەوێ، ئاوازی شیعرەکە خێرا دەبێ.

د — دووبارەبوونەوەی یەك دەنگی نەبزوێن یان بزوێن بە شێوەیەکی زۆرو سەرنجکێش لە یەك دێرە شیعردا، ئاوازێکی تایبەتی بە شیعرەکە دەداو هەستێکی تایبەتی لای خوێنەر دەبزوێنێ‌و کەشی مانایەکی تایبەتی دروست دەکا.

## بڕگە:

بڕگە گەلێ پێناسەی جیا جیای بۆ کراوە. پێناسەی هەرە باوی ئەمەیە:

بڕگە ئەو دەنگە، یان ئەو چەند دەنگەیە کە بە یەك هەناسە لە دەم دێتە دەرەوە. بڕگە بە بێ بزوێن نابێ‌و هەر بڕگەیەك تەنیا یەك دەنگی بزوێنی تێدایە جا هەرچەندە کورت بێ، یان هەرچەندە درێژ بێ.

پێکهاتەی بڕگە:

هەموو بڕگەیەك لە سێ خانە پێك دێ:

ئەلف — پەراوێزی سەرەتا. ئەم پەراوێزە هەمیشە (نەبزوێن)ی تێدایە. جا یەك (نەبزوێن) بێ، یان چەند (نەبزوێن)ێك. وایش دەبێ ئەم پەراوێزە بەتاڵ بێ‌و هیچ نەبزوێنی تێدا نەبێ.

ب — ناوك. ناوك هەمیشە (بزوێن)ی تێدایەو بڕگە نابێ لە یەك دەنگی (بزوێن) زیاتری تێدابێ. بڕگە بێ ناوك نابێ.

ج — پەراوێزی کۆتایی. ئەم پەراوێزەیش هەمیشە (نەبزوێن)ی تێدایە. جا یەك (نەبزوێن) بێ، یان چەند (نەبزوێن)ێك. وایش دەبێ ئەم پەراوێزە بەتاڵ بێ‌و هیچ نەبزوێنی تێدا نەبێ.

چەند سەرنجێك:

ئەلف – لە هەموو زمانێکدا، (ناوك)ی بڕگە دەبێ هەر هەبێ. بەڵام بوون‌و نەبوونی پەراوێزی یەکەم، یان پەراوێزی دووەم‌و یان هەردووکیان بە پێی زمانەکە دەگۆڕێ.

ب – بۆی هەیە هەر یەکە لە پەراوێزەکان چەند دەنگێکی (نەبزوێن)ی تێدابێ. ئەمەیش بە پێی زمانەکە دەگۆڕێ.

جۆرەکانی بڕگە:

بڕگە بە پێی پڕی‌و بەتاڵی پەراوێزی کۆتایی، دوو جۆرە:

ئەلف – بڕگەی داخراو: ئەو بڕگەیەیە کە پەراوێزی کۆتایی پڕ کرابێتەوە. واتە دەنگێکی نەبزوێن، یان چەند دەنگێکی نەبزوێنی تێدا بێ. وەکوو: دەم، چەند، پار، سارد...

ب – بڕگەی کراوە: ئەو بڕگەیەیە کە پەراوێزی کۆتایی بەتاڵ بێ. واتە هیچ دەنگی (نەزوێن)ی تێدا نەبێ. وەکوو: لە، وا، دوو...

| | پ ١ | ناوك | پ٢ |
|---|---|---|---|
| ١ | س | ە | ر |
| ٢ | د | ی | ... |

١– نموونەی (١) (سەر) بڕگەیەکی داخراوە چونکە پەراوێزی (٢)، واتە پەراوێزی کۆتایی پڕکراوەتەوە. دەنگی (نەبزوێن)ی (ر)ی تێدایە.

٢ – نموونەی (٢) (دی) برگەیەکی کراوەیە چونکە پەراوێزی کۆتایی بەتاڵە. هیچ دەنگی (نەبزوێن) تێدا نییە. بە کراوەیی ماوەتەوە. دەتوانین بە هەر دەنگێکی (نەبزوێن) پڕی بکەینەوە: ( دی/م، دی/ت، دی/ن، دی/ق...)

نیمچە بزوێن:

گوتمان لە کوردیدا، وەکوو هەر زمانێکی تر دوو جۆری سەرەکی دەنگ هەیە:

١- نەبزوێن ٢- بزوێن. ئەمە ئەگەر دەنگەکان بە جیاو سەربەخۆ دەربڕین بەڵام کە بیانخەینە ناو برگەو لە قسە بە کاریان بێنین، جۆرە دەنگێکی ترمان بۆ پەیدا دەبێ پێی دەگوترێ نیمچە بزوێن. لە کوردیدا، دوو نیمچە بزوێن هەن: (و، ی).

نیمچە بزوێن ئەو دەنگەیە کە لە خەسیەتی گشتیدا بزوێنەو لە خەسیەتی خستنە ناو برگەو بە کار هێناندا نەبزوێنە.

بۆ زیاتر روون کردنەوە، دەڵێین:

دەنگی نەبزوێن دوو خەسیەتی هەیە:

١-بە گشتی لە کاتی گۆ کردنی ئەو جۆرە دەنگەدا، ئەو تەوژمی هەوایەی لە سییەکانەوە دێتە دەرەوە بەرەو رووی بەربەستێکی تەواو یان ناتەواو دەبێتەوە.

٢- بە تایبەتی لە کاتی خستنە ناو برگەو ئاخاوتندا، هەمیشە دەکەوێتە پەراوێزی سەرەتا، یان کۆتایی برگەو هەرگیزاو هەرگیز ناوکی برگە پێك ناهێنێ.

دەنگی بزوێنیش دوو خەسیەتی هەیە:

١- بە گشتی لە کاتی گۆ کردنی ئەو جۆرە دەنگەدا، ئەو تەوژمی هەوایەی لە سییەکانەوە دێتە دەرەوە بەرەو رووی هیچ بەربەستێك نابێتەوە. بە ئازادی دێتە دەرەوە.

٢- به تایبەتی له کاتی خستنه ناو برگەو ئاخاوتندا، هەمیشه ناوکی برگه پێك دێنیّ. بزوێن هەرگیزاو هەرگیز ناکەوێتە پەراوێزەوە چ پەراوێزی سەرەتاو چ پەراوێزی کۆتایی.

نیمچه بزوێن بۆیه وای پیّ دەگوترێ چونکه له هەر یەکە له بزوێنو نەبزوێن خەسیەتێك وەردەگرێ. دوو خەسیەتەکەی نیمچه بزوێن ئەمانە:

١- به گشتی، له کاتی گۆ کردنیدا به شێوەیەکی جیاو سەربەخۆ، ئەو تەوژمی هەوایەی له سییەکانەوە دێته دەرەوە بەرەو رووی هیچ بەربەستێك نابێتەوە. به ئازادی دێته دەرەوە. ئەمه خەسیەتی گشتی بزوێنه.

٢- به تایبەتی، له کاتی خستنه ناو برگەو ئاخاوتندا، هەمیشه دەکەوێته پەراوێزی سەرەتا، یان کۆتایی برگەوە. ئەمەیش خەسیەتێکی دەنگی نەبزوێنه.

بەم جۆره نیمچه بزوێن خەسیەتی گشتی بزوێنو خەسیەتی تایبەتی نەبزوێنی هەیە.

|  | پ ١ | ناوك | پ ٢ |
|---|---|---|---|
| ١ | و | ه | ك |
| ٢ | خ | ۆ | ی |

*- له برگەی ژماره یەکدا(وەك)، دەنگی (و) نیمچه بزوێنه چونکه ئەگەر به تەنیا گۆی بکەین، تەژمی هەوای سییەکان هیچ بەربەستێکی نایەته پێش واته بزوینه. بەلام لەم برگەیەدا، ناوکی پێك نەهێناوه بەڵکو کەوتۆته پەراوێزی سەرەتا که شوێنی نەبزوێنه. واته له ناو ئەم برگەیەدا دەوری نەبزوێنی بینیوه.

*- له برگەی دووەمدا (خۆی)، دەنگی (ی) نیمچه بزوێنه چونکه ئەگەر به تەنیا گۆی بکەین، تەژمی هەوای سییەکان هیچ بەربەستێکی نایەته پێش واته

بزوینه. بەڵام لەم برگەیەدا، ناوكی پێك نەهێناوە بەڵكو كەوتۆتە پەراوێزی كۆتایی كە شوێنی نەبزوێنە. واتە لە ناو ئەم برگەیەدا دەوری نەبزوێنی بینیوە.

جۆرەكانی برگەی زمانی كوردی:

بۆ زانین و لێك جیا كردنەوەی جۆری برگەی كوردی، پێویستە بزانین دەنگی بزوێنی كوردی دووجۆرە:

ئەلف – بزوێنی كورت: ە، و، ی، بزرۆكە.

ب– بزوێنی درێژ: ا، وو، ۆ، یی، ێ.

تێبینی:

– لە شیعردا، (بزوێنی كورتی: و، ی) هەندێ جار بە پێی كێش و ئاوازی شیعرەكە لە برگە كورتدا بە (بزوێنی درێژ: وو، یی) دەخوێندرێنەوە.

– لە شیعردا، (بزوێنی درێژی: وو، ۆ، ێ، یی) هەندێ جار بە پێی كێش و ئاوازی شیعرەكە لە برگەی كراوەدا بە (بزوێنی كورت: و، ی) دەخوێندرێنەوە.

ئەمەیش جۆرەكانی برگەی كوردی:

١ – برگەی كورت: برگەیەكی كراوەیە. بزوێنەكەی كورتە. دوو جۆرە:

ئەلف – (نەبزوێن + بزوێنی كورت). وەكوو: (كو/ ڕە) لە وشەی (كوڕە)دا، (م/نە، ژ/نی، ك/پە، د/ڵم) لە وشەی (منە، ژنی، كپە، دڵم)دا.

ب– (نەبزوێن + نیمچە بزوێن + بزوێنی كورت) وەكوو (خوە) لە زاری كرمانجی سەروودا.

٢ – برگەی درێژ: چوار جۆرە:

ئەلف – (نەبزوێن + بزوێنی كورت+ نەبزوێن). وەكوو: سەر، دەم، كوڕ، بڕ...

ب – (نەبزوێن + نیمچە بزوێن + بزوێنی كورت + نەبزوێن). وەكوو: (خوەش) لە زاری كرمانجی سەروودا.

ج – (نەبزۆین + بزوێنی درێژ). وەکوو: لا، دی، تۆ، کێ...

د – (نەبزۆین + نیمچە بزوێن + بزوێنی درێژ). وەکوو: کوا، چیا، خوا...

٣- برگەی کەشیدە: سێ جۆرە:

ئەلف – (نەبزوێن + بزوێنی کورت + نەبزوێن + نەبزوێن). وەکوو: چەند، سەخت، کورد...

ب – ( نەبزوێن + بزوێنی درێژ + نەبزوێن). وەکوو: دوور، سال، شێر، ...

ج – ( نەبزوێن + نیمچە بزوێن + بزوێنی درێژ + نەبزوێن). وەکوو: خوار، سیار، دیار، بوار...

٤ – برگەی زایدە: دوو جۆرە:

ئەلف – ( نەبزوێن + بزوێنی درێژ + نەبزوێن+ نەبزۆن). وەکوو: سارد، ئارد، قۆرت، مێرد...

ب – ( نەبزوێن + نیمچە بزوێن + بزوێنی درێژ + نەبزوێن + نەبزوێن). وەکوو: خوارد، بوارد، کوارگ ...

<u>چونیەتی ئەم برگانە لە دێرە شیعردا:</u>

ئەم جۆرە برگانەی لە سەرەوە باس کران، لە کاتی هاتنیان لە دێرە شیعری عەرووزی کلاسیکیدا، مامەڵەی تایبەتییان لەگەڵدا دەکرێ:

– برگەی کورت (ژمارە، ١) نیشانەکەی (U)ەو هەندێ جار بە پێی کێش و ئاوازی شیعرەکە، بە برگەیەکی درێژ دەخوێنرێتەوە کاتێ برگەکە کراوە بێ.

– بڕگەی درێژ (٢، ج) نیشانەکەی (––)و هەندێ جار، بە پێی کێش‌و ئاوازی شیعرەکە، بە بڕگەیەکی کورت (U) دەخوێنرێتەوە کاتێ بڕگەکە کراوە بێ.

– بڕگەی کەشیدەی (٣: ئەلف، ب)، نیشانەکەی (–– .)ەو لە دێرە شیعردا، دەشێ بە دوو جۆر بێ:

– ئەگەر لە کۆتایی لەتی یەکەم، یان لەتی دووەمی دێرە شیعر بێ، هەمیشە حیسابی کەشیدەی بۆ دەکرێ‌و بەس(––.)

– ئەگەر لە سەرەتا، یان لە ناوەڕاستی لەتی یەکەم، یان لەتی دووەمی دێرە شیعر بێ، حیسابی کەشیدەی بۆ ناکرێ. بە پێی کێشی شیعرەکە، دەشێ بە جۆرێك لەم دوو جۆرە بخوێنرێتەوە:

*– دەشێ بە بڕگەیەکی درێژ حیساب بکرێ. وەکوو: چەند(––)، سەخت(––)، کورد(––)، دوور(––)،ساڵ(––)، شێر(––).

*– دەشێ بزرۆکەیەکی بۆ نەبزوێنی پەراوێزی کۆتایی زیاد بکرێ. بە مەوە دوو بزوێنی دەبێ‌و دەبێ بە دوو بڕگە: بڕگەیەکی درێژو بڕگەیەکی کورت) :سا/ڵ، شێ/ر.چەن/د، سەخ/ت، کور/د)(–– U).

– بڕگەی کەشیدە(٣،ج) لە ناوەڕاستی دێرە شیعردا، دەشێ بە جۆرێك لەم سێ جۆرە حیسابی بۆ بکرێ:

*– دەشێ بە یەك بڕگەی درێژ بخوێنرێتەوە (خوار، سیار، دیار، ––).

*– دەشێ بزرۆکەیەکی بۆ پەراوێزی کۆتایی زیاد بکرێ. بەمەوە دوو بزوێنی دەبێ‌و دەبێ بە دوو بڕگە: بڕگەیەکی درێژو بڕگەیەکی کورت:(خوا/ر، سیا/ر، دیا/ر – U). واتە وەکوو بڕگەی کەشیدەی(٣– ج) لێك دەدرێتەوە.

*- دەشێ بزرۆکەیەکی بۆ پەراوێزی سەرەتا زیاد بکرێ. بەمەوە دوو بزوێنی دەبێ‌و دەبێ بە دوو برگە: برگەیەکی کورت‌و برگەیەکی کەشیدە کە بە برگەیەکی درێژ دەخوێنرێتەوە: (خ/وار، س/یار، د/یار، U --).

- برگەی زایدە دەق وەکوو برگەی کەشیدە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ. تەنیا ئەوەندە هەیە هیچ حیسابێك بۆ نەبزوێنی کۆتایی پەراوێزی کۆتایی ناکرێ. ئەو نەبزوێنە لە کاتی جیا کردنەوەی برگەکاندا بە نەبوو دادەنرێ. بۆ نموونە: برەگەی(خوارد، بوارد، کوارگ)، لە سەرەتاو ناوەراستی دێرە شیعردا، دەشێ یەك برگەی درێژ بێ: (خوارد، بوارد، کوارگ --)، هەروەها دەشێ دوو برگە بێ: برگەیەکی درێژو برگەیەکی کورت :( خوارد، بوارد، کوارگ -- U)، دەشێ دوو برگە بێ، برگەیەکی کورت‌و برگەیەکی کەشیدە کە بە برگەی درێژ دەخوێنرێتەوە: (خ/وارد، ب/وارد، ك/وارگU --).

* برگەی کۆتایی دێرە شیعر ئەگەر کورت بێ، هەمیشە بە برگەیەکی درێژ دەخوێندرێتەوە چونکە کۆتایی شیعرەکەی لە سەر دەوەستێ. ئەم درێژکردنەوەی برگەی کورتی کۆتاییە پێی دەگوترێ (ئیشباع).

<u>لێك جیا کردنەوەی برگەو پێ‌و لەت:</u>

وەکوو لەمەودوا بە درێژی باسی دەکەین، دێری شیعری عەرووزی کلاسیکی لە دوو لەت پێك دێ. هەر لەتێك چەند پێ (تەفعیلە)یەو هەر پێیەك چەند برگەیەکە. بۆ دۆزینەوەی کێشی شیعرەکە، برگەو پێ‌و لەتەکان بەم جۆرە لە یەك جیا دەکەینەوە:

١- لە بەینی هەر برگەیەك‌و برگەیەکی تردا، هێڵێکی لار (/) دەکێشین، وەکوو: (ئەوا دیسان)(ئە/وا/ دی/سان). ئەم برگانە بەم جۆرەن: (U-- -- --.)

٢- لە نێوان هەر پێیەکو پێیەکی تر دوو هێڵی لار دەکێشین، وەکوو:

نە/ مر/دم/ من// ئە/گەر/ ئەم/ جا //رە/ بیّ/ تۆ

-- / -- / U / --/ -- / -- // U / -- / -- / --- // U

٣- لە نێوان هەر لەتێکو لەتێکی تر سێ هێڵی لار دەکێشین. ئەمە زیاتر لە نووسینی کۆن بە کار دەهات کە کاغەز کەم بووو هیچ ماوەیان لە نێوان لەتی یەکەمو لەتی دووەم جێ نەدەهێشت. هەموویان بەسەر یەکەوە دەنووسی. وەکوو:

نە/ مر/دم/ من// ئە/گەر/ ئەم/ جا//رە/ بیّ/ تۆ///نە/چم/ شەرت/ بیّ// هە/تا/ ئەم/ خوا//رە/ بیّ/

U / --/ -- / -- // U / -- / -- / --- // U / -- / --/// U--/ -- / -- // U / -
-- / -- / - / -- / --- // U

پێ:

برگەیەک، یان بە زۆری کۆمەڵە برگەیەکە بەسەر یەکەوە دەوترێنو دوای ئەوە وەستانێکی کەم دێ ئینجا پێیەکی تر دەست پێ دەکا تا لەتی یەکەمی دێرە شیعرەکە تەواو دەبێ. لەگەڵ تەواو بوونی لەتی یەکەم وەستانێکی زیاتر دێ. هەر بەم جۆرە لەتی دووەمیش دابەش چەند پێیەک دەبێو وەستانێکی کەم لە نێوان پێیەکاندا هەیەو لە کۆتایی دێرەکەدا وەستانو پشوویەکی تەواو دێ.

ئەمە بە کوردی پێ، لای هەندێ کەس هەنگاوی پێ دەگوترێ. لە عەرەبیدا (تەفعیلە)و لە ئینگلیزیدا(foot- پێ)و لە فەرەنسیشدا هەر (pied - پێ)ی بۆ بە کاردێ.

لە شیعری عەرووزی کلاسیکی، بۆ نموونە لە شیعرەکەی سەرەوەدا، پێیەکان ئەمانەن: (نە مردم من)، (ئەگەر ئەم جا)، (رە بێ تۆ). پێی یەکەمو دووەم هەر یەکە چوار برگەیە( برگەیەکی کورتەو سێ برگەی درێژی بە دوادا هاتووە)و پێی سێیەم سێ برگەیە (برگەیەکی کورتەو دوو برگەی درێژی بە دوادا هاتووە). لێرەدا ژمارەو جۆرو ریزی برگەکان جۆری پێیەکە دیاری دەکەن. ئەگەر ژمارە یان جۆری یان ریزی برگەکان، بگۆڕێ، جۆری پێیەکەیش دەگۆڕێ. با نموونەیەکی تر وەربگرین:

گەر دەپرسی من لە بەر چی کەم دەخۆم

لێك جیا کرنەوە برگەو پێیەکانی بەم جۆرەیە:

گەر/ دە/پر/سی// من/ لە/ بەر/ چی// کەم/ دە/خۆم

ئەم لەتە دێرە لە سێ پێ پێك هاتووە:( گەر/ دە/پر/سی)، (من/ لە/ بەر/ چی )، (کەم/ دە/خۆم ).

دوو پێی یەکەم هەر یەکە چوار برگەیە. برگەیەکی درێژ، ئینجا برگەیەکی کورت ئینجا دوو برگەی درێژ (-- / U / -- / --). پێی سێیەم سێ برگەیە. برگەیەکی درێژ برگەیەکی کورت، برگەیەکی درێژ (-- U/ / --). لەم لەتە شیعرەدا، هەرچەندە وەکوو لەتە شیعری پێشوو، پێیەکانی پێشەوە چوار برگەو پێی دواوە سێ برگەیە واتە پێیەکان لە بارەی ژمارەی برگەوە وەکوو یەك وان بەڵام ریزی برگەی کورتو برگەی درێژیان جیایە. پێی لەتە شیعری یەکەم، بریتییە لە برگەیەکی کورت سێ برگەی درێژی بە دوادا دێ: U) / --/ --/--) کەچی پێی لەتە شیعری دووەم، لە برگەیەکی درێژ ئینجا برگەیەکی کورت ئینجا

دوو بڕگەی درێژ (-- / U / -- / --) پێك هاتووە. لێرەدا پێیەکان جیان‌و کێشەکەیشیان جیایە. پێیەکان جیان چونکە هەر چەندە لە هەردووکیاندا، پێیەکە چوار بڕگەیەو لە هەردووکیشیاندا، پێیەکە لە یەك بڕگەی کورت‌و سێ بڕگەی درێژ پێك هاتووە، بەڵام ریزی جۆری بڕگەکانیان جیایە. لە یەکەمیاندا، بڕگەی یەکەم کورتەو لە دووەمیاندا، بڕگەی دووەم کورتە.

لە کێشی بڕگەییدا، کە شیعری میللی‌و زۆربەی شیعری زاری گۆرانی پێ نووسراوە، پێیەکە تەنیا بە ژمارەی بڕگەکان دیاری دەکرێت‌و بەس. حیساب بۆ کورتی‌و درێژی بڕگەکان ناکرێ. بۆ نموونە:

گوڵ چوون رووی ئازیز نەزاکەت پۆشان

لێك جیا کردنەوەی بڕگەو پێیەکانی بەم جۆرەیە:

گوڵ/ چون/ رووی/ ئا/زیز// نە/زا/کەت/ پۆشان/

ئەم لەتە شیعرەی مەولەوی لە دوو پێ پێك هاتووە.(گوڵ چون رووی ئازیز)، (نەزاکەت پۆشان). هەر یەکە لەم دوو پێیە پێنج بڕگەیە. وەستانێکی کەم لە دوای پێی یەکەمدا هەیە. ئەو پێنج بڕگەیەی پێیەکە پێك دێنن، لە بارەی کورتی‌و درێژییەوە هەر چۆن بن‌و هەر چۆن دابەش بووبن لە جۆری پێ‌و کێشەکە ناگۆڕێ. بۆ نموونە لێرەدا پێی یەکەم لە سێ بڕگەی درێژ(گوڵ، چون، ئا)و دوو بڕگەی کەشیدە (رووی، زین) پێك هاتووە. بڕگە کەشیدەکانیش هەر حیسابی بڕگەی درێژیان بۆ دەکرێ.

## دێر

لــه رووی عەرووزییــەوە یەکەیــەکی ئیقاعییــە هــەموو پییێــەکانی کێــشی هۆنراوەکەی تێدایە.. دێرە شیعر بە پێی شێوەی شیعرەکە، دوو جۆرە:

١- شیعری ستوونی: ئـەو شـیعرەیە کـە هـەموو دێرەکـانی بەسـەر دوو لەتـدا دابەش دەبـێو دێرەکـانی لـە سـەرەتا تـا کۆتـایی یـەك کێـشیان هەیـەو درێـژیان (هەندێ حاڵەتی دەگمەن نەبێ) بە قەد یەکە. وەکـوو هـەموو شـیعری کلاسـیکیو مەسنەوییەکانو شیعری میللی. لەم جۆرە شعرەدا، دێرە شـیعر هەمیـشە لـە دوو لەت پێك دێ.

٢- لە شیعری ئازادی چەندێتیو چۆنێتیدا، واتە لە شیعری عەرووزیو شـیعری ناعەرووزیدا، دێرە شیعر ئەوەندەیە کە لە یەك خەت دەنووسرێ. تەنیا یەك لەتە.

بۆ نموونە: دێرە شیعری ستوونی وەکوو:

ڕۆمو جوو چاکە ئیتتیفاقی هەیە

کوردە بێ غیرەتیو نیفاقی هەیە (حاجی ٢٦٤)

ئەمە یەك دێرو، دوو لەتە.

نموونە بۆ دێرە شیعری ئازاد:

بە هۆرەی تفەنگی کاوانی بن بنار لوتکەکان

ئەستێرەی پشکۆیان

ڕژانە ناو چاوی بەیانی خۆرەوە. (شێرکۆ بێکەس).

ئەمە سێ دێرە شیعرە.

## پێك هاتەی دێرە شیعری ستوونی:

دێرە شیعری ستوونی لە دوو لەت پێك دێ. لەتی یەکەم پێی دەگوترێ: سەدر (صدر)و لەتی دووەم پێی دەگوترێ: عەجز (عجز). هەر یەکە لە سەدرو عەجز لە چەند بەشێك پێك دێ، بەم جۆرەی خوارەوە:

سەدر (صدر): پێی یەکەمی دێرە شیعرە.

عەرووز (عروض): پێی کۆتایی سەدرە.

ئیبتیدا (ابتداء): پێی یەکەمی عەجزە.

زەرب (ضرب): پێی کۆتایی دێرە شیعرە.

حەشوو (حشو): پێی، یان پێیەکانی نێوان سەدرو عەرووزو ئیبتیداو زەربە.

| دێر | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەدر | | | | عەجز | | | |
| سەدر | حەشوو | حەشوو | عەرووز | ئیبتیدا | حەشوو | حەشوو | زەرب |

جۆرەکانی دێرە شیعری کلاسیکی:

١- دێری تەواو(التام): ئەو دێرەیە ژمارەی پێیەکانی وەکوو ناو بازنەکەی وا بێ‌و حوکمی گۆڕان (زیحافو عیللە) لە هەموو پێیەکاندا (سەدرو ئیبتیداو حەشووو عەرووزو زەرب) وەکوو یەك بێ. عەرووزو زەرب جیاوازییان نەبێ لەگەڵ پێیەکانی دی.

٢- دێری وافی (الوافی): ئەو دێرەیە وەکوو دێری (تەواو) ژمارەی پێیەکانی وەکوو ناو بازنەکەی وا بێ بەڵام حوکمی گۆڕان (زیحافوعیللە)ی عەرووزو زەرب لە پێیەکانی دی جیا بێ.

٣- دێری لەتکراو (المشطور): ئەو دێرەیە لە دوو لەتەکە لەتێکی لابرا بێ. مابێتەوە یەك لەت. ئەم دێرە عەرووزو زەربەکەی یەکە.

٤- دێری کورت کراوە (المجزوء): ئەو دێرەیە دوو پێی لابرا بێ. پێیەك لە سەدرو پێیەك لە عەجز. ئەگەر دێرەکە لە ناو بازنەی خۆیدا شەش پێ بێ دەمێنێتەوە چوار پێ، ئەگەر هەشت پێ بێ دەمێنێتەوە شەش پێ.

٥- دێری شەکەت (المنهوك): ئەو دێرەیە کە دوو سێیەکی لابرابێ. دوا پێی دەبێ بە عەرووزو زەرب.

٦- دێری زیاد کراو (الزائدە): ئەو دێرەیە کە لە هەر لەتیك پێیەك یا دوو پێی بۆ ژمارەی پێیەکانی ناو بازنەکەی زیاد کرابێ. ئەگەر دێرەکە لە ناو بازنەی خۆیدا، شەش پێ بێ (٣ +٣) دەبێ بە هەشت پێ (٤ +٤) یان دە پێ (٥ +٥). ئەمە لە عەرەبیدا نەهاتووە، لە کوردیو فارسیو زمانەکانی تری ناعەرەبیدا هاتووە. لە کوردیدا، (٤+ ٤) گەلێ زۆرە بەڵام (٥ + ٥) زۆر دەگمەنە.

٧- دێری یەك پێیی (الموحد): ئەو دێرەیە کە لە یەك پێ پێك هاتبێ. ئەمە هەر زۆر دەگمەنە.

٨- دێری موسمەت (المصمت): ئەو دێرەیە کە عەرووزەکەی لە کێشو سەروادا لە زەربەکەی جیا بێ.

٩- دێری سەروادار (المقفى): ئەو دێرەیە کە عەرووزەکەی لە کێش‌و سەروادا وەکوو زەربەکەی وابێ بێ ئەوەی ئەو وەك یەك بوونە ببێ بە هۆی گۆڕانی عەرووزەکە بە کەم یان بە زیاد.

١٠- دێری موسەڕڕەع (المصرع): ئەو دێرەیە کە عەرووزەکەی لە کێش‌و سەروادا وەکوو زەربەکەی وا بێ، وەکوو دێری سەروادار، بەڵام لێرەدا وەك یەك بوونەکە بە گۆڕانی عەرووزەکە بە کەم یان بە زیاد دێتە دی.

١١- دێری مودەووەر(المدور): ئەو دێرەیە کە وشەیەکی دابەش بووبێ بەسەر کۆتایی سەدرو سەرەتای عەجزدا.

جۆری کێش لە زمانەکانی دونیادا:

هەندێ جۆری شیعر هەن لە سەر بنچینەی تایبەتی هاتوون . هەر زمانێك بە پێی سیستەمی دەنگسازی خۆیەوە سەر بە یەکێ لەو بنچینانەیە. ئەمەیش جۆرەکانی کێشی شیعری جیهانی:

١- کێشی ژمارەیی (Numerical): لەم جۆرە کێشەدا، ژمارەی برگەکانی هەر لەتە شیعرێك‌و شوێنی وەستانی دوای پێیەکان جۆری کێشەکە دیاری دەکا. وەکوو کێشی شیعری فرەنسی‌و ئیتالی‌و ئەسپانی‌و کێشی شیعری میللی‌و رەسەنی کوردی.

٢- کێشی چەندیتی(Quantitative): لەم جۆرە کێشەدا، کورتی‌و درێژی برگەو چۆنیەتی ریزبوونیان جۆری کێشەکە دەست نیشان دەکا. وەکوو شیعری عەرەبی‌و سەنسکریتی‌و یۆنانی کۆن.

٣- کێشی چۆنێتیی (Qualitative): لەم جۆرە کێشەدا، بەهێزیو بێهێزی بڕگە جۆری کێشەکە دیاری دەکا. وەکوو کێشی شیعری ئینگلیزیو ئەلمانی.

٤- کێشی تەبەقەیی(Tonic): ئەم جۆرە کێشە بە پێی بەرزیو نزمی تەبەقەی دەنگ دیاری دەکرێ. وەکوو کێشی شیعری چینیو ڤیتنامی.

# باسی دووەم

# بنەمای کێشی عەرووزی

ڕەگەزی بنچینەیی هەر زمانێك دەنگە. هەندێ دەنگ دەکەونە پاڵ یەکترو بڕگە دروست دەبێ وەکوو لە پێشەوە باسمان کرد. ئینجا لە بارەی کێشەوە، لە بڕگە هەورازتر (پایە– ڕوکن) دێ کە لە بڕگەیەك یان لە چەند بڕگەیەك پێك دێ.

## ( پایە )و جۆرەکانی:

پایە یەکەیەکی ئیقاعییە لە چەند دەنگێك پێك دێو بە چەند پایەیەك پێ (تەفعیلە) دروست دەکەن.

سێ پایەی عەرووزی هەن. هەر یەکێکیان دوو جۆرە:

١– سەبەب: بڕگەیەك، یان دوو بڕگەیە (دوو پیتە. ئەو دوو پیتە، یان یەکەم بزواوەو دووەم وەستاوە، یان هەر دوو پیت بزواون.). سەبەب دوو جۆرە:

ئەلف – سەبەبی سووك: بڕگەیەکی درێژە (دوو پیتە: یەکەم بزواوەو دووەم وەستاوە.) نیشانەکەی ئەمەیە: (––). وەکوو: دەم، نا.

ب – سەبەبی گران: دوو بڕگەی کورتە (دوو پیتە. هەردووکیان بزواون.) نیشانەکەی ئەمەیە: (UU). وەکوو: شەلە، کوڕە. ئەمە. منە.

٢ – وەتەد: دوو بڕگەیە (سێ پیتە. دووی بزواوو یەکی وەستاو.) وەتەد دوو جۆرە:

ئەلف – وەتەدی کۆ: دوو بڕگەیە. بڕگەیەکی کورتو بڕگەیەکی درێژ (سێ پیتە. بزواو، بزواو، وەستاو.) نیشانەکەی ئەمەیە: U) ––). وەکوو: بەلەم، سەدا.

ب – وەتەدی بڵاو: دوو بڕگەیە: بڕگەیەکی درێژو بڕگەیەکی کورت (بزواو، وەستاو، بزواو). نیشانەکەی ئەمەیە: (––U). وەکوو: شەختە، دۆخە. سایە

تێبینی: وەتەدی کۆو وەتەدی بڵاو جۆری بڕگەیان پێچەوانەی یەکترە: وەتەدی کۆ بڕگەیەکی کورتو بڕگەیەکی درێژە U) ––) کەچی وەتەدی بڵاو بڕگەیەکی درێژو بڕگەیەکی کورتە (––U).

٣– فاسیلە، یان فازیلە(فاضلة): سێ بڕگە، یان چوار بڕگەیە. (چوار پیتە یان پێنج پیتە. هەردووکیان هەموو پیتەکانیان بزواوە تەنیا پیتی کۆتاییان وەستاوە.) فاسیلە دوو جۆرە:

ئەلف – فاسیلەی بچووك: سێ بڕگەیە. دوو بڕگەی کورتو بڕگەیەکی درێژ(UU––). (چوار پیتە: بزواو، بزواو، بزواو، وەستاو). وەکوو: کوڕەکەم، ئەوەتەم.

ب – فاسیلەی گەورە: چوار بڕگەیە. سێ بڕگەی کورتو بڕگەیەکی درێژ(UUU––). ( پێنج پیتە: بزواو، بزواو، بزواو، بزواو، وەستا). وەکوو: نەدەگەڕا، دەمەوەری.

تێبینی:

١ – ئەم شەش پایەیە بەریزلە عەرەبیدا، لە رستەی ( لم أر علی ظهْر جبل سمكة)و لە کوردیدا لە رستەی (ئەو لەمە بترسایە، لە هەرا نەدەگەڕا) کۆ بوونەتەوە.

خشتەی جۆرەکانی پایە:

| پایە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| سەبەب | | وەتەد | | فاسیلە | |
| سووک | گران | کۆ | بلاو | بچووک | گەورە |
| لَمْ | أرَ | علی | ظَهْرِ | جبلِ | سَمكةً |
| ئەو | لەمە | بتر | سایە | لە هەرا | نەدەگەڕا |

پێی سەرەکی لە وەتەدێكو سەبەبێك یان دوو سەبەب دروست دەبێ. پێی سەرەکی نابێ وەتەدی تێدا نەبێ، هەروەکوو نابێ سێ سەبەبی تێدا بێ. وەتەد لە سەبەب بەهێزترە. تا وەتەدەکە لە پێشەوەتر بێ پێیەکە بەهێزترە.

٢ – هەندێ زانای عەرووزی وەکوو زەمەخشەری (القسطاس المستقیم ل ٥٩) لایان وایە تەنیا دوو پایە هەن: سەبەو وەتەد. ئەوان دان بە فاسیلەدا نانێن وەکوو پایەیەکی سەربەخۆ چونکە دەڵێن:

فاسیلەی بچووک لە دوو پایەی لە خۆی بچووکتر پێك دێ: سەبەبێکی گرانو سەبەبێکی سووک ( UU + --)--. هەروەها دەڵێن:

فاسیلەی گەورە لە دوو پایەی لە خۆی بچووک پێك دێ: سەبەبێکی گرانو وەتەدێکی کۆ (UU + U--)--.

پێ(تەفعیلە)ی عەرووزی: (پێ) کۆمەڵە دەنگێکی لە پایە گەورەترە. دوو جۆرە (پێ) هەیە: ١ – پێی سەرەکی ٢ – پێی ناسەرەکی یان گۆڕاو. پێی سەرەکی لە دوو، یان سێ پایە بەسەر یەکەوە دروست دەبێ. واتە هەر (پێ)یەك لە دوو یان سێ پایە پێك دێ. پێی سەرەکی ژمارەیان هەشتە. هەندێ بە دەی دادەنێن و هەندێکیش تەنیا بە حەفتی دادەنێن.

پێیە سەرەکییەکان و پێك هاتنیان:

١– فَعولُنْ(U-- --) (وەتەدی کۆ + سەبەبی سووك)

٢– فاعِلُنْ (-- U--) (سەبەبی سووك + وەتەدی کۆ)

٣– مَفـاعیلُنْ (U --- --- ---)(وەتـەدی کـۆ + سـەبەبی سـووك + سەبەبی سووك)

٤– مُسْتَفْعِلُنْ (-- -- U --)( سەبەبی سووك + سەبەبی سووك + وەتەدی کۆ)

٥– فـاعِلاتُنْ (-- U-- --)( سـەبەبی سـووك + وەتـەدی کـۆ + سـەبەبی سووك)

٦– مُفـاعَلَتُنْ (UU --U -- )(وەتـەدی کـۆ + سـەبەبی گـران + سـەبەبی سووك)

یان:( وەتەدی کۆ + فاسیلەی بچووك)

٧– مُتَفاعِلن (U --U U--) (سەبەبی گران + سەبەبی سووك + وەتەدی کۆ)

یان:( فاسیلەی بچووك + وەتەدی کۆ)

٨– مَفْعولاتُ (سەبەبی سووك + سەبەبی سووك + وەتەدی بلاو)

تێبینی:

ئەلف– ئەوانەی بڕوایان وایە پێیە سەرەکییەکان ژمارەیان دەیە. ئەم دوو پێیەی خوارەوە زیاد دەکەن:

٩– مُسْتَفْعِ لُنْ (-- --U --)(سەبەبی سووك + وەتەدی بلاو + سەبەبی سووك)

١٠– فاع لاتُنْ (-- U-- --)(وەتەدی بلاو + سەبەبی سووك + سەبەبی سووك)

ب – ئەوانەی بڕوایان وایە ژمارەی پێیەکان حەفتن، پێی (مفعولا.ت) حیساب ناکەن. چونکە ئەم پێیە لە عەرەبیدا (هەروەها لە کوردیشدا) بە سالمی بە کار نەهاتووە، تەنیا موزاحەفاتو مەعلولەکانی بە کار هاتوون.

چەند سەرنجێك:

١– پێی یەکەمو دووەم (فعولن، فاعلن)، هەر یەکە لە دوو پایە (پێنج پیت) پێك هاتووە. هەر یەکە سێ بڕگەیە. پێیان دوگوترێ پێی بچووك، یان پێی پێنجی. هەردووکیان لە هەمان جۆری پایە پێك هاتوون. بەڵام شوێنی پایەکانیان گۆڕاوە. بە پاشو پێش کردنی پایەکان لە یەك وەردەگیرێن. (فعولن) لە (فاعلن) بەهێزترە چونکە وەتەدەکەی لە پێشەوە.

٢– پێی سێیەمو چوارەمو پێنجەم (مفاعیلن، مستفعلن، فاعلاتن)، هەر یەکە لە سێ پایە (حەوت پیت) پێك هاتووە. هەر یەکە چوار بڕگەیە. هەرسێکیان لە هەمان جۆری پایە پێك هاتوون، بەڵام شوێنی پایەکانیان گۆڕاوە. بە پاشو پێش کردنی پایەکان لە یەك وەردەگیرێن. (مفاعیلن) لە دووەکەی دی بەهێزترە چونکە

وەتەدەکەی لە پێشەوەیە. دوای ئەو لە بەهێزیدا، (فاعلاتن) دێ چونکە وەتەدەکەی لە ناوەڕاستە، لە دوای هەموویانەوە (مستفعلن) دێ چونکە وەتەدەکەی لە کۆتاییە.

٣- پێی شەشەم و حەوتەم (مفاعلتن، متفاعلن)، هەر یەکە لە دوو یان لە سێ پایە (حەوت پیت) پێك هاتووە. هەر یەکە پێنج بڕگەیە. هەردووکیان لە هەمان جۆری پایە پێك هاتوون بەڵام شوێنی پایەکانیان جیایە. بە پاش و پێش کردنی پایەکان لێك وەردەگیرێن. (مفاعلتن) لە (متفاعلن) بەهێزترە چونکە وەتەدەکەی لە پێشەوەیە.

٤- پێی هەشتەم و نۆیەم و دەیەم(مفعولات، مستفع لن، فاع لاتن)، هەر یەکە لە سێ پایە ( حەوت پیت)پێك هاتووە. هەر یەکە چوار بڕگەیە. هەرسێکیان لە هەمان جۆری پایە پێك هاتوون بەڵام شوێنی پایەکانیان جیایە. بە پاش و پێش کردنی پایەکان لێك وەردەگیرێن. ئەم سێ پێیە هەر یەکە وەتەدێکی بڵاوی تێدایە. وەتەدی بڵاو تەنیا لەمانەدا هەیە.

٥- دوو پێی یەکەم و دووەمی لێ دەرچێ کە پێی بچووك، یان پێنجین، ئەوانی دی هەموو پێی گەورە، یان حەوتین.

٦- دوو پێی (مستفع لن، فاع لاتن)، بۆیە بە پێی سەربەخۆ دادەنرێن و لە (مستفعلن، فاعلاتن) جیان چونکە جۆری وەتەدەکەو شوێنی وەتەدەکەیان جیایە. وەتەدیش ڕەگەزی سەرەکی و بەهێزی پێیە. (مستفعلن) وەتەدەکەی وەتەدی کۆیەو کەوتۆتە کۆتاییەوە کەچی (مستفع لن) وەتەدەکەی وەتەدی بڵاوەو کەوتۆتە ناوەڕاستەوە. (مستفع لن) لە (مستفعلن) بەهێزترە. لە وەرگرتنی

زیحاف‌و عیللەیش جیان. هەروەها (فاع لاتن) وەتەدەکەی بڵاوەو کەوتۆتە سەرەتاوە کەچی (فاعلاتن) وەتەدەکەی کۆیەو کەوتۆتە ناوەڕاستەوە. (فاع لاتن) لە (فاعلاتن) بەهێزترە چونکە وەتەدەکەی لە پێشەوەیە. ئەم دوو پێیەیش لە وەرگرتنی زیحاف‌و عیللەدا جیان.

٧- عەرەب پیتەکانی ئەم تەفعیلە سەرەکیانەیان لە رستەی (لمعت سیوفنا) کۆ کردۆتەوە. لە کوردیدا، دەتوانین لە (نعلی موستفا) کۆیان بکەینەوە.

زیحاف‌و عیللەو پێیە ناسەرەکییەکان: ئەو پێیانەی لە سەرەوە باسکران پێی سەرەکی‌و بنچینەیین. بە هۆی گۆڕانی تایبەتییەوە هەندێ پێی ناسەرەکییان لێ دروست دەبێ. گۆڕانەکان دوو جۆرن: یەکەم: زیحاف، دووەم: عیللە.

## یەکەم: زیحاف:

زیحاف: گۆڕانێکی کەمکردنەوەیە دەچێتە سەر سەبەبی پێ. ئەو پێیەی زیحافی دەچێتە سەر پێی دەگوترێ موزاحەف. زیحاف دوو جۆرە:

١ - زیحافی تاك، ٢ - زیحافی جووت، یان لێکدراو.

١ - زیحافی تاك: یەك گۆڕانە دەچێتە سەر پێ. زیحافی تاك ئەمانە:

ئەلف: خەبن( الخبن):

کورت کردنەوەی برگەی درێژی یەکەمی پێیە لە سەبەبدا، یان لابردنی پیتی وەستاوی دووەمی پێیە لە سەبەبدا. واتە خەبن دەچێتە سەر پێیەك کە

سەرەتاکەی سەبەب بێ. ئەو پێیەی خەبنی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەخبوون. خەبن ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فاعلن: فَعِلُنْ

مستفعلن: مُتَفْعِلُنْ. دەگۆڕێ بۆ (مفاعلن)

فاعلاتن: فَعِلاتُنْ

مَفْعولاتُ: معولاتُ. دەگۆڕێ بۆ (فَعولاتُ)

مستفع لن: مُتَفْعِ لُنْ. دەگۆڕێ بۆ (مفاع لن –)

ب– وەقس(الوقص): لابردنی برگەی کورتی یەکەمی پێیە لە سەبەبدا، یان لابردنی پیتی بزواوی یەکەم، یان دووەمی پێیە لە سەبەبدا. ئەو پێیەی وەقسی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەوقووس. وەقس ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مُتَفاعِلُنْ: مفاعلن

ج– ئیزمار (الاضمار): گۆڕینی دوو برگەی کورتی یەکەمی پێیە( واتە سەبەبی گران) بۆ برگەیەکی درێژ(واتە سەبەبی سووك)، یان وەستاندنی پیتی بزواوی دووەمی پێیە لە سەبەبدا. ئەو پێیەی ئیزماری بچێتە سەر پێی دەگوترێ موزمەر. ئیزمار ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مُتَفاعِلُنْ: مُتْفاعِلُنْ دەگۆڕێ بۆ مستفعلن

د- تەی(الطی): کورتکردنەوەی بڕگەی درێژی دووەمی پێیە لە سەبەبدا، یان لابردنی پیتی وەستاوی چوارەمی پێیە لە سەبەبدا. ئەو پێیەی تەی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەتوی. تەی ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

مستفعلن: مُسْتَعِلُنْ. دەگۆڕێ بۆ (مُفْتَعِلُنْ)

مَفْعولاتُ: مَفْعُلاتُ. دەگۆڕێ بۆ (فاعلاتُ)

هـ- قەبز (القبض): کورت کردنەوەی بڕگەی درێژی سێیەمی پێیە لە سەبەبدا، یان لابردنی پیتی وەستاوی پێنجەمی پێیە لە سەبەبدا. ئەو پێیەی قەبزی بچێتە سەر پێ دەگوترێ مەقبووز. قەبز ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فعولن: فعولُ

مفاعیلن: مفاعِلن

و- عەقل (العقل): لابردنی بڕگەی کورتی سێیەم یان چوارەمی پێیە لە سەبەبدا، یان لابردنی پیتی بزواوی چوارەم یان پێنجەمی پێیە لە سەبەبدا. ئەو پێیەی عەقلی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەعقوول. عەقل ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مُفاعَلَتُنْ: مفاعَتُن یان مفالَتُنْ دەگۆڕێ بۆ (مفاعلن)

ز- عەسب(العصب): گۆڕینی دوو بڕگەی کورتی چوارەم و پێنجەمی پێیە بۆ بڕگەیەکی درێژ لە سەبەبدا، یان وەستاندنی پیتی بزواوی پێنجەمی پێیە لە سەبەبدا. ئەو پێیەی عەسبی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەعسووب. عەسب ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مفاعَلَتُنْ: مفاعَلْتُنْ دەگۆڕێ بۆ مفاعیلن

ح- کەف( الكف): کورتکردنەوەی بڕگەی درێژی چوارەمە لە سەبەبدا، واتە لابردنی پیتی حەوتەمی وەستاوی پێیە لە سەبەبدا. ئەو پێیەی کەفی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەکفووف. کەف ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

مفاعیلن: مفاعیلُ

فاعلاتن: فاعلاتُ

مفاعلتن: مفاعلتُ

مستفع لن: مستفع لُ

فاع لاتن: فاع لاتُ

تێبینی: ئەو گۆڕانانەی دێنە سەر پیتی دووەمی پێ، هەمان گۆڕان دێنە سەر پیتی پێنجەم بەڵام ناوی گۆڕانەکان جیایە ، واتە زاراوەکان جیان. لەم بارەیەوە محەمەد حوسێن قەزوینی ناسراو بە کیشوان لە ئورجوزەکەیدا دەڵێ:

وخامس الجزء لثانيه يقع

بالقبض والعقل وبالعصب تبع (عبدالحميد الراضي، شرح تحفة الخليل، ل٤٥)

٢- زیحافی جووت، یان لێکدراو: دوو زیحافی تاکە بە یەکەوە دەچنە سەر یەك پێ. زیحافی جووت ئەمانەن:

ئەلف- خەبل (الخبل): بریتییە لە خەبن و تەی. ئەو پێیەی خەبلی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەخبوول. خەبل ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

مستفعلن: مُتَعِلُنْ. دەگۆڕێ بۆ فَعِلَتُنْ.

مفعولاتُ: مَعُلاتُ. دەگۆڕێ بۆ فَعِلاتُ

ب- خەزل (الخزل): بریتییە لە ئیزمارو تەی. ئەو پێیەی خەزلی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەخزوول. خەزل ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

متفاعلن: مُتْفَعِلُنْ. دەگۆڕێ (مُفْتَعِلُنْ)

ج- شەکل (الشکل): بریتییە لە خەبنو کەف. ئەو پێیەی شەکلی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەشکوول. شەکل ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

فاعلاتن: فَعِلاتُ

د- نەقس (النقص): بریتییە لە عەسب و کەف. ئەو پێیەی نەقسی بچێتە سەر پێ دەگوترێ مەنقووس. نەقس ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مفاعلتن: مفاعَلْتُ دەگۆڕێ بۆ مفاعیلُ.

<u>تێبینی:</u>

لە پێناسەی زیحافدا گوتمان گۆڕانێکی کەم کردنەوەیە دەچێتە سەر سەبەب. کەم کردنەوەکە بریتییە لە:

ئەلف: یان لابردنی پیتێکە وەکوو (فاعلن بە خەبن، پیتی دووەمی وەستاوی کە لە سەبەبدایە، لادەدرێو دەبێ بە (فعلن)، ئەمە زیحافی تاکە.

ب- یان کەم کرنەوەی دوو پیتە وەکوو (فاعلاتن بە خەبن، پیتی دووەمی لادەدرێو لە هەمان کاتدا بە کەف، پیتی حەفتەمی لادەدرێ دەبێ بە (فَعِلاتُ). ئەمە زیحافی جووتە (شەکل).

ج- یان کەم کردنەوەی حەرەکەیەکە، واتە وەستاندنی پیتێکی بزواوە لە سەبەبدا، وەکوو: (مُتَفاعلن) بە زیحافی ئیزمار دەبێ بە (مُتْفاعلن) دەگۆڕێ بۆ (مستفعلن).

## دووەم: عیللە

عیللە گۆڕانێکی کەم کردنەوە، یان زیاد کردنە دەچێتە سەر سەبەب یان وەتەد. ئەو پێیەی عیللەی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەعلوول. عیللە دوو جۆرە:

١- یەکەم عیللەی کەم ٢- عیللەی زیاد

١- عیللەی کەم: کەم کردنەوەیەکە دەچێتە سەر سەبەب یان وەتەد. عیللەی کەم ئەمانەن:

ئەلف: حەزف (الحذف): لابردنی بڕگەی درێژی کۆتایی پێیە لە سەبەبدا. واتە لابردنی سەبەبی سووکی کۆتایی پێیە. ئەو پێیەی حەزفی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەحزووف حەزف ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فعولن: فعو. دەگۆڕێ بۆ (فعلُ)

مفاعیلن: مفاعی. دەگۆڕێ بۆ (فعولن).

فاعلاتن: فاعِلا. دەگۆڕێ بۆ (فاعلن).

ب- قەتف (القطف): بریتییە لە عەسبو حەزف. واتە گۆڕینی دوو بڕگەی کورتی سێیەمو چوارەمی پێ بۆ بڕگەیەکی درێژ لە سەبەبداو لابردنی بڕگەی درێژی کۆتایی پێ کە سەبەب بێ. ئەو پێیەی قەتفی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەقتووف. قەتف ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مفاعلتن: مفاعَلْ. دەگۆڕێ بۆ فعولن.

ج- حەزەز(الحذذ): لابردنی وەتەدی کۆ لە کۆتایی پێدا. ئەو پێیەی حەزەزی دەچێتە سەر پێی دەگوترێ ئەحەز. حەزەز ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فاعلن: فا دەگۆڕێ بۆ (فع)

متفاعلن: مُتَفا. دەگۆڕێ بۆ (فَعِلُنْ).

مستفعلن: مُسْتَفْ. دەگۆڕێ بۆ (فع لن).

د- سەلم(الصلم): لابردنی دوو بڕگەی درێژو کورتی کۆتایی پێ، واتە لابردنی وەتەدی بڵاوی کۆتایی پێ. ئەو پێیەی سەلمی دەچێتە سەر پێ دەگوترێ ئەسلەم. سەلم ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مفعولاتُ: مفعو. دەگۆڕێ بۆ (فع لن).

ئەمە لە عەرەبیدا وایە کوردیو فارسیدا جیایە.

هـ- وەقف (الوقف): گۆڕینی دوو بڕگەی درێژو کورتی کۆتایی پێ بۆ بڕگەیەکی کەشیدە، واتە وەستاندنی پیتی بزواوی کۆتایی وەتەدی بڵاوی کۆتایی پێ. ئەو پێیەی وەقفی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەوقووف. وەقف ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مفعولاتُ: مفعولاتْ دەگۆڕێ بۆ (مفعولان)

و- کەشف (الکشف): لابردنی بڕگەی کورتی کۆتایی پێیە، یان لابردنی پیتی بزواوی حەوتەمی پێیە. ئەو پێیەی کەشفی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەکشووف. کەشف ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

مفعولاتُ: مفعولا. دەگۆڕێ بۆ (مفعولن).

ز- قەسر (القصر): لابردنی برگەی درێژی کۆتایی پێ لە سەبەبداو بە کەشیدەکردنی برگەی پێشەوەیەتی ، واتە لابردنی پیتی وەستاوی کۆتایی سەبەبی سووکی کۆتایی پێ و وەستاندنی پیتی پێشەوەی. ئەو پێیەی قەسری بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەقسوور. قەسر ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فعولن: فعولْ.

مفاعیلن: مفاعیلْ. دەگۆڕێ بۆ (فعولان)

فاعلاتن: فاعلاتْ. دەگۆڕێ بۆ (فاعلان)

مستفع لن: مستفع لْ. دەگۆڕێ بۆ (مفعولن).

ح- قەتع (القطع): لابردنی برگەی درێژی کۆتایی پێ لە وەتەکی کۆداو بە کەشیدەکردنی برگەی پێشەوەیەتی ، واتە لابردنی پیتی وەستاوی کۆتایی وەتەدی کۆی کۆتایی پێ و وەستاندنی پیتی پێشەوەی. ئەو پێیەی قەتعی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەقتووع. قەتع ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فاعلن: فاعل. دەگۆڕێ بۆ (فع لن).

متفاعلن: متفاعِلْ. دەگۆڕێ بۆ (فَعِلاتن).

مستفعلن: مستفعلْ. دەگۆڕێ بۆ (مفعولن).

ط- بەتر (البتر): بریتییە لە حەزفو قەتع. لە دوو بڕگەی درێژی کۆتایی پێدا، کە دەبێ دوا بڕگە سەبەبی سووکو بڕگەی پێش کۆتایی لە وەتەدی کۆدا بێ، هەردوو بڕگە درێژەکە لادەبرێنو بڕگەی پیش ئەوان کورتە درێژ دەکرێتەوە. واتە لابردنی سەبەبی سووکی کۆتایی پێو لابردنی دوا پیتی وەستاوی وەتەدی کۆی پێش سەبەبەکەو وەستاندنی پیتی پێشەوەی. ئەو پێیەی بەتری بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەبتوور. بەتر ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فعولن: فَعْ

فاعلاتن: فاعِلْ. دەگۆڕێ بۆ (فع لن).

ئەمە لە عەرەبیدا وایە. لە کوردیو فارسیدا جیایە.

٢- عیللەی زیاد: زیادەیەکە دەچێتە سەر کۆتایی پێ. عیللەی زیاد ئەمانەن:

ئەلف- تەسبیغ یان ئیسباغ (التسبیغ او الاسباغ). بە کەشیدەکرنی بڕگەی درێژی کۆتایی پێ لە سەبەبی سووکدا. واتە زیاد کردنی پیتێکی وەستاو بۆ کۆتایی سەبەبی سووکی کۆتایی پێ. ئەو پێیەی تەسبیغی بچێتە سەر پێی دەگوترێ موسەببەغ. تەسبیغ ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فعولن: فعولان.

مفاعیلن: مفاعیلان.

فاعلاتن: فاعلاتان.

مفاعلتن: مفاعلتان.

مستفع لن: مستفع لان.

ب– تەزییل یان ئیزالە ( التذیل او الاذالة): بریتییە لە بە کەشیدە کردنی برگەی درێژی کۆتایی پیێ لە وەتەددا. واتە زیاد کردنی پیتێکی وەستاو بۆ وەتەدی کۆی کۆتایی پێ. ئەو پێیەی ئیزالەی بچێتە سەر پێی دەگوترێ موززال. ئیزالە ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فاعلن: فاعلان.

مستفعلن: مستفعلان.

متفاعلن: متفاعلان.

ج– تەرفیل: زیاد کردنی برگەیەکی درێژە بۆ کۆتایی وەتەدی کۆی کۆتایی پێ. واتە: زیاد کردنی سەبەبێکی سووکە بۆ کۆتایی وەتەدی کۆی کۆتایی پێ. ئەو پێیەی تەرفیلی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مورەففەل. تەرفیل ئەم پێیە ناسەرەکییانەی خوارەوە دروست دەکا:

فاعلن: فاعلاتن.

مستفعلن: مستفعلاتن

متفاعلن: متفاعلاتن

## جیاوازی زیحافو عیللە:

گرنگترین جیاوازیی نێوان زیحافو عیللە ئەمانە:

١- زیحاف تەنیا دەچێتە سەر سەبەب کەچی عیللە دەچێتە سەر سەبەبو وەتەد.

٢- زیحاف تەنیا کەم کردنەوەیە کەچی عیللە دەشێ کەم کردنەوە بێ یان زیاد کردن بێ.

٣- زیحاف دەچێتە سەر هەموو پێیەکانی دێرە شیعر کەچی عیللە تەنیا دەچێتە سەر عەرووزو زەرب.

٤- زیحاف لازم نییە واتە ئەگەر لە دێرێك هاتە سەر پێیەك مەرج نییە لە هەموو دێرەکان بێتە سەر هەمان پێ. شاعیر کەیفی خۆیەتی کەی بە کاری دێنێو کەی بە کاری ناهێنێ کەچی عیللە لازمە واتە کە شاعیر لە دێری یەکەم، لە عەرووز یان لەزەربدا بە کاری هێنا، دەبێ لە هەموو دێرەکانی هۆنراوەکەدا، ژمارەیان هەر چەندەی هەبێ، بە کاریان بێنێ. ئەمە لە زمانەکانی تری ناعەرەبی وەکوو فارسیو کوردی گۆڕاوە، دەشێ زیحافیش وەکوو عیللە بە کار بێ.

### عیللەی زیحافانە (العلل الجاریە مجری الزحاف):

جگە لەو زیحافو عیللانەی لە سەرەوە باس کران، هەندێ گۆڕانی تر هەن پێیان دەگوترێ (عیللەی زیحافانە) چونکە لەبەر ئەوەی دەچنە سەر وەتەد عیللەن، زیحاف نین. زیحاف ناچێتە سەر وەتەدو لەبەر ئەوەی لازم نین زیحافن، چونکە عیللە لازمە. واتە لە گۆڕینی پێدا عیللەنو لە بەکار هاتنی ناو هۆنراوەدا

زیحافن. عیللە دەچێتە سەر کۆتایی پێ وەکوو لە سەرەوەدا بۆمان دەرکەوت، کەچی لە عیللەی زیحافانەدا، گۆڕانەکە دەچێتە سەر وەتەدی کۆی ناوەڕاستو سەرەتای پێ. ئەمەیش هەندێ لە عیللەی زیحافانە:

١- تەشعیس (التشعیث): لابردنی بڕگەی کورتی دووەمی پێیە لە (فاعلاتن)دا. واتە لابردنی پیتی دووەم یان سێیەم لە وەتەدی کۆی (فاعلاتن)دا. ئەو پێیەی تەشعیسی بچێتە سەر پێی دەگوترێ موشەعەس. تەشعیس ئەم پێیە ناسەرەکییەی خوارەوە دروست دەکا:

فاعلاتن: فاعاتن یان فالاتن دەگۆڕێ بۆ (مفعولن).

٢- خەرم (الخرم): لابردنی پیتی یەکەمی وەتەدی کۆی سەرەتای پێیە. ئەو پێیەی خەرمی بچێتە سەر پێی دەگوترێ ئەخرەم. (لە عەرەبیدا تەنیا لە سەرەتای دێرە شیعر دێ). خەرم زۆر جۆرەو جۆرەکانی بە پێی جۆری پێیەکەو هاتنی زیحافی ترەوە لە پێیەکەدا دەگۆڕێ. جۆرەکانی خەرم ئەمانەن: سەلم (الثلم)، سەرم (الثرم)، خەرم (الخرم)، شەتر (الشتر)، خەرب (الخرب)، عەزب (العضب)، عەقس (العقص)، قەسم (القصم)و وەجەم (الوجم).

لەم جۆرانەی خەرمدا، خەرب لە هەموویان زیاتر لە کوردیدا بە کار هاتووە. ئەویش پێناسەکەی بەم جۆرەیە:

خەرب (الخرب): بریتییە لە خەرمو کەف. ئەو پێیەی خەربی بچێتە سەر پێی دەگوترێ ئەخرەب.

مفاعیلن بە خەرب دەبێ بە (فاعیلُ)و دەگۆڕێ بۆ (مفعولُ).

## چەند سەرنجێك لە بارەی زیحافو عیللەو عیللەی زیحافانە:

١- ئەو زیحافو عیللانەی بە زۆری لە کوردیدا هاتوون ئەمانەن:

خەبنو تەیو قەبزو کەفو شەکلو حەزفو قەسرو قەتعو صەلم (بە مانا کوردییەکەی)و وەقفو کەشفو هەر چوار زیحافی روباعی(هەتمو جەبو زەلەلو بەتر)و هەندێ گۆڕانی تریش کە ناوی تایبەتییان بۆ دانەنراوە وەکوو: ئەصلەم موسبیبەغو مەخبوون مەحزووفو مەخبوون مەقسووری (فاعلاتن) کە یەك لە دوای دەبن بە (فع لان، فعلن، فعلان). هەروەها مەتوی مەکشووفو مەتوی مەوقووفی (مفعولات) کە یەك لە دوای یەك دەبن بە (فاعلن، فاعلان).

٣ - لە کوردیدا، لە عیللەی زیحافانە بە زۆری خەربو لە زیحافی جووتدا، تەنیا شەکل هاتووە.

٤- لە عەرەبیدا، تەرفیل دەچێتە سەر (متفاعلن)، بەڵام لە کوردیدا، دەچێتە سەر (مستفعلن).

٥- ئەوەی لە عەرەبیدا، پێی دەگوترێ، (بەتر) کە بریتییە لە حەزفو قەتع، لە فارسیو کوردیدا پێی دەگوترێ سەلم (الصلم). (بەتر): لە فارسیو کوردیدا، بریتییە لە کۆبوونەوەی خرمو جەب (لابردنی هەردوو سەبەبی سووکی مفاعیلن). دەبێ بە (فا)و دەگۆڕێ بۆ (فع). ئەمە زیاتر لە کێشی روباعی دێ.

٦- حەزەز، کە لابردنی وەتەدی کۆی کۆتایی پێیە، لە عەرەبیدا دەچێتە سەر (متفاعلن)، کەچی لە فارسیدا دەچێتە سەر (مستفعلن). (الرازی، المعجم، ل٦٣)

٧- هەتم‌و جەب‌و زەلەل لە عەرەبیدا نین. ئەم سییانە لەگەل بەتر بە مانا فارسییەکەی لە فارسی‌و کوردیدا بە زۆری لە کێشی روباعیدا بە کارهاتوون.

- هەتم: کۆبوونەوەی حەزف‌و قەسرە لە (مفاعیلن)دا. سەبەبی کۆتایی لادەبرێ‌و سەبەبی پێش ئەویش قەسر دەکرێ. دەبێ بە (مفاعْ)و دەگۆڕێ بۆ (فعولْ). ئەو پێیەی هەتمی بچێتە سەر پێی دەگوترێ ئەهتەم.

- جەب: بریتییە لە لابردنی هەردوو سەبەبی (متفاعلن) دەمێنێ (علن)و دەبێ بە (مفا)و دەگۆڕێ بۆ (فعلْ). ئەو پێیەی جەبی بچێتە سەر پێی دەگوترێ مەجبووب

- زەلەل: کۆبوونەوە خەرم‌و هەتمە لە (مفاعیلن)، دەبێ بە (فاعْ). ئەو پێیەی زەلەلی بچێتە سەر پێی دەگوترێ ئەزەل.

- بەتر: کۆبوونەوەی خەرم‌و جەبە لە (مفاعیلن)، دەبێ بە (فا)و دەگۆڕێ بۆ (فع). ئەو پێیەی بەتری بچێتە سەر پێی دەگوترێ ئەبتەر.

٨- فارس زیحاف‌و عیللەیان لێک جیا نەکردۆتەوە. هەموویان لە ژێر ناوی (زیحافات) باس کردووەو هەندێ زیحافیان بۆ زیاد کردووە. وەکوو: سەلخ‌و تەمس‌و جەدەع‌و نەحرو رەفع‌و هەتم‌و جەب‌و زەلەل‌و ...(الرازی، المعجم٦٢،ل٦٤، ل ١٢٢). کورد صەلم‌و هەتم‌و جوب‌و زەلەل‌و بەتری( بە مانا فارسییەکەی) بە کار هێناوە.

## بازنەی پێیەکان:

بەر لەوەی بچینە سەر بازنەو کێشەکانو چۆنیەتی لە یەك وەرگرتنی کێشەکان لە ناو یەك بازنەدا روون بکەینەوە، وا چاکە بازنەی پێیەکان روون بکەینەوە.

هەموو پێیەکان چوار بازنەیان هەیە:

١- بازنەی فعولن: پێی (فعولنو فاعلن)ی تێدایە.

٢- بازنەی مفاعلتن: پێی (مفاعلتنو متفاعلنو فاعلاتُكَ)ی تێدایە.

٣- بازنەی مفاعیلن: پێی (مفاعیلنو مستفعلنو فاعلاتن)ی تێدایە.

٤- بازنەی فاع لاتن: پێی (فاع لاتنو مستفع لنو مفعولات)ی تێدایە.

ئێستایش بۆ روون کردنەوەی بازنەی پێیەکان:

<u>بازنەی یەکەم: بازنەی فعولن:</u>

(فعولن) دوو پایەیە. کەواتە دوو پێی تێدایە چونکە هەر پێیەك بە پایەیەك دەست پێ دەکا. دوو پایەکە بریتین لە: وەتەدی کۆو سەبەبی سووك.

(فعولن)بە وەتەدی کۆ دەست پێ دەکا. پایەی یەکەمی کە وەتەدی کۆیە (فعو) دەگوازینەوە بۆ دواوە. دەبێ بە (لن فعو). ئەمە لە سەبەبێکی سووكو وەتەدێکی کۆ پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەیە: (U_ _ ). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (فاعلن). واتە بە گواستەوەی پایەیەی یەکەمی فعولن بۆ دواوە، پێی (فاعلن) دروست بوو.

هەمان شت لەگەڵ پێی (فاعلن) دووبارە دەکەینەوە. (فاعلن) لە دوو پایە پێك هاتووە: سەبەبێکی سووكو وەتەدێکی کۆ. پایەی یەکەمی، کە سەبەبی سووکە،

دەبەینە دواوە دەبیّ بە (علن فا). ئەمە لە وەتەدێکی کۆو سەبەبێکی سووک پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەیە: (U_ _). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (فعولن). واتە بە گواستنەوەی پایەی یەکەمی (فاعلن) بۆ دواوە پێی (فعولن) دروست بوو کە پێی یەکەمە. واتە گەڕاینەوە سەرەتا. بەم جۆرە هەر پایەکان پاش‌و پێش بکەو (فعولن) دەبیّ بە (فاعلن)و (فاعلن) دەبێتەوە بە (فعولن). هیچ پێی تر دروست نابیّ. بەردەوام لە نێوان ئەم دووانەدا دەخولێتەوە.

بازنەی دووەم: بازنەی مفاعلتن:

(مفاعَلَتن) دوو پایەیە (وەتەدێکی کۆ (مفا) و فاسیلەیەکی بچووک (عَلَتُنْ)، یان سیّ پایەیە (وەتەدێکی کۆ (مفا) و سەبەبێکی گران (عَلَ)و سەبەبێکی سووک (تن)...)ە. ئەگەر بە دوو پایە لێکی بدەینەوە بازنەکە دوو پێی تێدایەو ئەگەر بە سیّ پایە لێکی بدەینەوە سیّ پێی تێدایە. چونکە هەر پێیەك بە پایەیەك دەست پیّ دەکا.

با بە سیّ پایە وەری بگرین:

(مفاعلتن) بە وەتەدی کۆ دەست پیّ دەکا. پایەی یەکەمی کە وەتەدی کۆیە (مفا) دەگوازینەوە بۆ دواوە. دەبیّ بە (علتن مفا). ئەمە لە سەبەبێکی گران‌و سەبەبێکی سووک‌و وەتەدێکی کۆ پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەیە: (U_ _ UU). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (متفاعلن). واتە بە گواستەوەی پایەیەی یەکەمی (مفاعلتن) بۆ دواوە پێی (متفاعلن) دروست بوو.

هەمان شت لەگەڵ پێی (متفاعلن) دووبارە دەکەینەوە. (متفاعلن) لە سیّ پایە پێك هاتووە: سەبەبێکی گران‌و سەبەبێکی سووک‌و وەتەدێکی کۆ. پایەی

یەکەمی، کە سەبەبی گرانە، دەبەینە دواوە دەبێ بە (تن مفاعل). ئەمە لە سەبەبێکی سووک‌و وەتەدێکی کۆو سەبەبێکی گران پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەبە: (_UU _ U). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (فاعلاتك). واتە بە گواستنەوەی پایەی یەکەمی (متفاعلن) بۆ دواوە پێی (فاعلاتك) دروست بوو.

هەمان شت لەگەڵ پێی (فاعلاتك) دووبارە دەکەینەوە. (فاعلاتك) لە سێ پایە پێك هاتووە: سەبەبێکی سووك‌و وەتەدێکی کۆو سەبەبێکی گران. پایەی یەکەمی کە سەبەبێکی سووکە (فا) دەبەینە دواوە دەبێ بە (علاتك فا). ئەمە لە وەتەدێکی کۆو سەبەبێکی گران‌و سەبەبێکی سووك پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەیە: (_UU U _). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (مفاعلتن). واتە بە گواستنەوەی پایەی یەکەمی پێی (فاعلاتك) بۆ دواوە، پێی (مفاعلتن) دروست بوو کە پێی یەکەمی ئەم بازنەیە. بەم جۆرە هەر پایەکان پاش‌و پێش بکەو (مفاعلتن) دەبێ بە (متفاعلن)و (متفاعلن) دەبێ بە (فاعلاتك)و (فاعلاتك) دەبێتەوە بە مفاعلتن. هیچ پێی تر دروست نابێ. بەردەوام لە نێوان ئەم سییانەدا دەخولێتەوە.

<u>بازنەی سێیەم: بازنەی مفاعیلن:</u>

(مفاعیلن) سێ پایەیە. لە وەتەدێکی کۆ (مفا)و دو سەبەبی سووك (عی، لن) پێك هاتووە. (مفاعیلن) بە وەتەدی کۆ (مفا) دەست پێ دەکا. پایەی یەکەمی، کە وەتەدی کۆیە (مفا)، دەگوازینەوە بۆ دواوە. دەبێ بە (عیلن مفا). ئەمە لە دوو سەبەبی سووك‌و وەتەدێکی کۆ پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەیە: (_ _ U_). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (مستفعلن). واتە بە گواستەوەی پایەی یەکەمی (مفاعلین) بۆ دواوە، پێی (مستفعلن) دروست بوو.

هەمان شت لەگەڵ پێی (مستفعلن) دووبارە دەکەینەوە. (مستفعلن) لە سێ پایە پێك هاتووە: دوو سەبەبی سووك(مس، تف)و وەتەدێکی کۆ (علن). پایەی یەکەمی، کە سەبەبی سووکە (مس) دەبەینە دواوە دەبێ بە (تفعلن مس)). ئەمە لە سەبەبێکی سووكو وەتەدێکی کۆو سەبەبێکی سووك پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەبە: (U__ _). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (فاعلاتن). واتە بە گواستنەوەی پایەی یەکەمی (مستفعلن) بۆ دواوە پێی (فاعلاتن) دروست بوو.

هەمان شت لەگەڵ پێی (فاعلاتن) دووبارە دەکەینەوە. (فاعلاتن) لە سێ پایە پێك هاتووە: سەبەبێکی سووك (فا)و وەتەدێکی کۆ (علا)و سەبەبێکی سووك (تن). پایەی یەکەمی، کە سەبەبێکی سووکە، دەبەینە دواوە دەبێ بە (علاتن فا). ئەمە لە وەتەدێکی کۆو دوو سەبەبی سووك پێك هاتووەو رەمزی برگەکانی بەم جۆرەیە: (U_ _ _). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (مفاعلین). واتە بە گواستنەوەی پایەی یەکەمی پێی (فاعلاتن) بۆ دواوە، پێی (مفاعلین) دروست بوو کە پێی یەکەمی ئەم بازنەیەیە. بەم جۆرە هەر پایەکان پاشو پێش بکەو (مفاعلین) دەبێ بە ( مستفعلن)و (مستفعلن) دەبێ بە (فاعلاتن)و (فاعلاتن) دەبێتەوە بە (مفاعلین). هیچ پێی تر دروست نابێ. بەردەوام لە نێوان ئەم سییانەدا دەخولێتەوە.

٣- <u>بازنەی چوارەم: بازنەی فاع لاتن:</u>

(فاع لاتن) سێ پایەیە. لە وەتەدێکی بڵاو (فاع)و دو سەبەبی سووك (لا تن) پێك هاتووە. (فاع لاتن) بە وەتەدی بڵاو (فاع) دەست پێ دەکا. پایەی یەکەمی، کە وەتەدی بڵاوە (فاع)، دەگوازینەوە بۆ دواوە. دەبێ بە (لا تن فاع). ئەمە لە

دوو سەبەبی سووكو وەتەدێکی بڵاو پێك هاتووەو رەمزی بڕگەکانی بەم جۆرەیە: (_ _ _U ). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (مفعولاتُ). واتە بە گواستەوەی پایەی یەکەمی (فاعِ لاتن) بۆ دواوە، پێی (مفعولاتُ) دروست بوو.

هەمان شت لەگەڵ پێی (مفعولاتُ) دووبارە دەکەینەوە. (مفعولاتُ) لە سێ پایە پێك هاتووە: دوو سەبەبی سووك(مف، عو)و وەتەدێکی بڵاو (لات). پایەی یەکەمی، کە سەبەبی سووکە (مف)، دەبەینە دواوە دەبێ بە (عو لاتُ مف)). ئەمە لە سەبەبێکی سووكو وەتەدێکی بڵاوو سەبەبێکی سووك پێك هاتووەو رەمزی بڕگەکانی بەم جۆرەبە: (_U __). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە (مستفع لن). واتە بە گواستنەوەی پایەی یەکەمی (مفعو لات) بۆ دواوە پێی (مستفع لن) دروست بوو.

هەمان شت لەگەڵ پێی (مستفع لن) دووبارە دەکەینەوە. (مستفع لن) لە سێ پایە پێك هاتووە: سەبەبێکی سووك (فا)و وەتەدێکی بڵاو (تفع)و سەبەبێکی سووك (لن). پایەی یەکەمی، کە سەبەبێکی سووکە، دەبەینە دواوە دەبێ بە (تفع لن مس). ئەمە لە وەتەدێکی بڵاوو دوو سەبەبی سووك پێك هاتووەو رەمزی بڕگەکانی بەم جۆرەیە: (_ _U _). تەفعیلەی بەرامبەر بەم رەمزانە بریتییە لە (فاع لاتن). واتە بە گواستنەوەی پایەی یەکەمی پێی (مستفع لن) بۆ دواوە، پێی (فاع لاتن) دروست بوو کە پێی یەکەمی ئەم بازنەیەیە. بەم جۆرە هەر پایەکان پاشو پێش بکەو (فاع لاتن) دەبێ بە ( مفعولاتُ)و (مفعولاتُ) دەبێ بە (مستفع لن)و (مستفع لن) دەبێتەوە بە (فاعِ لاتن). هیچ پێی تر دروست نابێ. بەردەوام لە نێوان ئەم سییانەدا دەخولێتەوە.

لە لاپەڕەی دادێ سەیری وێنەی بازنەکانی پێیەکان بکە:

## چوار بازنەکەی پێیەکان



## بازنەو کێشە عەرووزییەکان

جۆری پێیەکان‌و شێوەی ریزبوونیان لە دێرە شیعردا دەبێ بە هۆی دروست بوونی کێشی جیا جیا. ئەگەر لە خوارەوە دەست پێ بکەین: بچووکترین شت دەنگە، چەند دەنگێك برگە دروست دەکەن‌و چەند برگەیەك پایە دروست دەکەن‌و چەند پایەیەك پێ دروست دەکەن‌و چەند پێیەك کێش دروست دەکەن‌و هەر کۆمەڵە کێشێکیش دەکەونە ناو بازنەیەك. پێیە سەرەکییەکان کێشی سەرەکی دروست دەکەن‌و پێیە ناسەرەکییەکان قالبە کێشەکان، واتە لقە کێشەکان، دروست دەکەن.

قالب (لق)ی کێش لە عەرەبی‌و کوردیدا:

کێشی سەرەکی واتە ئەوانەی وەکوو ناو بازنەی خۆیان بە کارهاتوون. لە کوردی‌و عەرەبیدا وەکوو یەك وان. بەڵام لە دروست کردنی قالب (لق)ە کێشدا جیان. جیاوازییەکانیان ئەمانەن:

١- هەرچەند زەرب بنچینەی کێشەو کێشی لە سەر رۆدەنرێ، لە عەرەبیدا، ناوی لقە کێشەکان بە عەرووزو ئینجا زەربەکان وەسف دەکرێ: بۆ نموونە دەڵێن: تەویل یەك عەروزو سێ زەربی هەیە. مەدید چوار عەروزو حەفت زەربی هەیەو بەسیت چوار عەرووزو حەفت زەربی هەیەو وافیر دوو عەرووزو سێ زەربی هەیەو کامیل سێ عەرووزو نۆ زەربی هەیەو ....لە هەرکێشێکدا، بە پێی کێشەکە زەربەکان دەچنەوە پاڵ عەرووزەکان بۆ نموونە .کێشی وافیر کە دوو عەرووزو سێ زەربی هەیە. عەرووزو زەربەکان بەم جۆرە هاتوون:

ئەلف – عەرووزی یەکەم: تەواوی مەقتووفە (فعولن)و زەربەکەیشی هەر تەواوی مەقتووفە (فعولن).

ب — عەرووزی دووەم: بەشکراوی دروستە (مفاعلتن)و دوو زەربی هەیە: یەکەم دروست وەك عەرووزەکەی (مفاعلتن). دووەم مەعسووب (مفاعیلن).

کەچی لە کوردیدا، زەربەکە دەکرێتە بنچینەو هەر لقە کێشێك چەند عەرووزێکی هەیە. بۆ نموونە: کێشی هەزەجی تەواو دوو عەرووزی هەیەو کێشی رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووف چوار عەرووزی هەیە. عەرووزی لقە کێشەکانی کوردی لە نێوان دووو چواردان.

٢- لە عەرەبیدا، تەنیا بە هوی عیللەوە کە تەنیا دەچێتە سەر عەرووزو زەرب لقە کێشی جیاجیا دروست دەبیّ، واتە لقە کێشەکان تەنیا بە عەرووزو زەرب لە یەك جیا دەکرێنەوە، کەچی لە کوردیدا، زیحافو عیللە هەردووکیانو بە گۆڕانی عەروزو زەرب یان پێیەکانی تریش لقە کێش دروست دەکەن. واتە زیحافیش هەندیّ جار دەوری عیللە دەگێڕیّ. هەر بۆیەشە فارسەکان هەموو گۆڕانەکانیان لە ژێر یەك ناو کۆکردۆتەوە : زیحافو باسی عیللەیان نەکردووە.

هەر کێشێکی سەرەکی تەنیا یەك جۆرە پیّ، یان دوو جۆرە پێی جیاوازی تێدایە. هەر دێرێك لە شەش پیّ (٣ +٣) یان لە هەشت پیّ (٤ + ٤) دروست دەبیّ. کێشەکانیش هەر کۆمەڵ کۆمەڵ لەناو یەك بازنەدانو بە پاشو پێش کردنی پایەکانیان لە ناو بازنەکەدا دەخولێنەوەو لێك وردەگیرێن. مەرج نییە ژمارەی کێشەکانی هەموو بازنەکان بە قەدەر یەك بیّ. بازنە هەیە تەنیا دوو کێشی تێدایە (وەکو بازنەی پێنجەم)و بازنە هەیە نۆ کێشی تێدایە (وەکوو بازنەی چوارەم). کێشەکانی ناو هەر بازنەیەك لە هەندیّ خەسیەتدا وەکوو یەك وان.

ئەمــەیش بازنــەو کێـشەکانو پێیــەکانیان لەگــەڵ هەنــدێ روون کردنــەوەی پێویست:

بازنەی یەکەم (المختلف – جیاوان):

بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە پێی کێشەکانی جیـاوازن لـە بـچووکی (فعـولن، فاعلن)و گەورەییدا (مفاعیلن، مستفعلن، فاعلاتن).

١– کێشی تەویل (الطویل):

فعولن مفاعیلن فعولن مفاعیلن فعولن مفاعیلن فعولن مفاعیلن

٢– کێشی مەدید (المدید):

فاعلاتن فاعلن فاعلاتن فاعلن متفاعلن فاعلن فاعلاتن فاعلن

٣– کێشی موستەتیل (المستطیل):

مفاعیلن فعولن مفاعیلن فعولن مفاعیلن فعولن مفاعیلن فعولن

ئەم کێشە پشت گوێ خراوە.

٤– کێشی بەسیت (البسیط):

مستفعلن فاعلن مستفعلن فاعلن مستفعلن فاعلن مستفعلن فاعلن

٥– کێشی مومتەد (الممتد):

فاعلن فاعلاتن فاعلن فاعلاتن فاعلن فاعلاتن فاعلن فاعلاتن

ئەم کێشە پشت گوێ خراوە.

سەرنج:

سەرنجی گشتی:

١- کێشی تەویل(درێژ) بۆیە پێی دەگوترێ تەویل چونکە هەمیشە بە تەواوی دێ. بەشکراو (مەجزوء)و کەرتکراو (مەشتوور)و شەکەت (منهوک)ی نییە، یان بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە ژمارەی پیتەکانی دێرێکی دەگاتە ٤٨ پیت. لە هیچ کێشێکی تردا ئەوەندە پیتە لە یەك دێردا نایە.

کێشی مەدید(کشاو) بۆیە پێی دەگوترێ مەدید چونکە پێیە حەفتییەکانی بە سەر پێیە پێنجیەکانیدا دەکشێن‌و پییێە پێنجییەکانی بە سەر پێیە حەفتییەکانیدا دەکشێن. دەشڵێن بۆیە پێی دەگوترێ مەدید چونکە لە هەر پێیەکی حەفتیدا، دوو سەبەبی سووك کشاون، هەروەها دەڵێن بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە وەتەدی کۆی لە ناوەڕاستی پێیە حەفتییەکان دەکشێ.

کێشی بەسیت (بڵاو) بۆیە پێی دەگوترێ بەسیت چونکە سەبەبەکانی ( واتە برگە درێژەکانی) لە سەرەتای پێیە حەفتییەکاندا بڵاو بوونەتەوە، یان بە دوای یەکدا هاتوون. یان دەڵێن بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە لە کاتی (خەبن) بووندا ، سێ پیتی بزواوی بە دوای یەکدا دێ.

٢- ئەم بازنەیە پێنج کێشی تێدایە. سیانیان (تەویل‌و مەدیدو بەسیت) بە کار هاتوون‌و دوانیان(موستەتیل‌و مومتەد) پشت گوێ خراون.

٣- هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە لە هەشت پێ پێك هاتووە (٤ +٤).

٤- هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە لە دوو پێی جیاواز پێك هاتووە. پێیەکی بچووك (فعولن، فاعلن)و پێیەکی گەورە (مفاعیلن، مستفعلن، فاعلاتن). ئەم دوو جۆرە پێیە لە هەموو کێشەکاندا، بە نۆرە یەك لە دوای دووبارە دەبنەوە. ئەم جۆرە کێشە پێی دەگوترێ (کێشی دەوری).

سەرنجی تایبەت بە کوردی:

١-ئەو دوو کێشەی لە عەرەبیدا پشت گوێ خراون (موستەتیلو مومتەد) لە کوردیشدا نەهاتوون.

٢-کێشی تەویل لە کوردیدا زۆر بە دەگمەن بە کار هاتووە. ئەوەی تا ئێستا زانرابێ تەنیا نالی یەك شیعری بەو کێشە نووسیوە (دەروونی لیداریششارەزووری وە بەردیهی...). ئەم شیعرە تێکەڵاوییەکی سەیرە لە کوردیو عەرەبی. داڕشتنو ڕێزمانەکەی عەرەبییەو وشەی کوردی بۆ بە کار هاتووە بۆیە من پێم وایە ئەم شیعرە دەچێتە خانەی شیعری عەرەبییەوە. مەلا عەبدولکەریمی مودوڕیسیش لە کتێبی (بەدیعو عەروزی نامی، ١٠٤)دا هۆنراوەیەکی درێژی بۆ نموونەی کێشی تەویل نووسیوە.

٣-کێشی مەدیدیش زۆر بە بە دەگمەن لە کوردیدا بە کار هاتووە. تەنیا نالبەند شیعرێکی درێژی بەم کێشە نووسیوەو لوتفیش شیعرێکی کورتی هەیە دەشێ بیبەینەوە سەر ئەم کێشە.

٤-کێشی بەسیت تا رادەیەك لە کوردیدا بە کار هاتووە. نزیکەی ( ٠٤٣ ٪)ی شعری کلاسیکی پێ نووسراوە. حەفت قالب(لق)ی بەسیت لە کوردیدا بە کار

هـاتووە . شـاعیرانی وەکـوو وەفـایی‌و نـالی‌و نالبەنـدو ناری‌و مفتـی پێنجـوینی‌و مەحوی‌و عەونی‌و سەفوەت‌و سالم‌و دەشتی‌و جزیـری‌و مـەلا تـاهیری بەحرکـەیی‌و پەرتۆیی هەکاری‌و مەلای باتەیی‌و ئەسیری‌و ئەحمـەدی کـۆر بـە کاریـان هێنـاوە. قەسیدەی بوردە، کە لە سەر کێشی بەسیتە، مەلا حوسێنی فانی و مـەلا مستەفا سەفوەت‌و مەلا تاهیری بەحرکەیی بە هەمان کێشی بەسیت کردوویانە بە کوردی.

<u>بازنەی دووەم (المؤتلف – تەبا):</u>

بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە پێی کێشەکان لـە رووی گـەورەو بـچووکییەوە رێك‌و تەبان. هەموویان پێی حەوتین (مفاعلتن، متفاعلن):

١– کێشی وافیر (الوافر – فرە):

مفاعلتن مفاعلتن مفاعلتن     مفاعلتن مفاعلتن مفاعلتن

٢–کێشی کامیل (الکامل– تەواو)

متفاعلن متفاعلن متفاعلن     متفاعلن متفاعلن متفاعلن

٣– کێشی موتەوەففیر (المتوفر):

فاعلاتك فاعلاتك فاعلاتك     فاعلاتك فاعلاتك فاعلاتك

ئەم کێشە پشت گوێ خراوە.

## سەرنج:

### سەرنجی گشتی:

کێشی وافیر (فرە) بۆیە پێی دەگوترێ وافیر چونکە وەتەدی پێیەکانی فرەن واتە زۆرن،، یان دەڵێن لە بەر ئەوەی حەرەکەکانی فرەن. پێیەکانی هیچ کێشێکی تر ئەوەندە حەرەکەیان نییە تەنیا کامیل نەبێ.

کێشی کامیل بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە زۆرترین حەرەکەی تێدایە. دێری ٣٠ حەرەکەی تێدایە. راستی کێشی وافیریش ٣٠ حەرەکەی تێدایە بەڵام وافیر هەمیشە بە مەقتووفی بە کار هاتووە.

١- ئەم بازنەیە سێ کێشی تێدایە. دووانیان بە کار هاتوون: (وافیرو کامیل)و یەکێکیان (موتەوەففیر) بە کار نەهاتووە، پشت گوێ خراوە. ئەم بازنەیە سێ کێشی تێدایە چونکە هەر یەکە لە پێیەکانیان دوو سەبەبو وەتەدێکی تێدایە. ئەگەر دوو سەبەبەکە بە فاسیلەی بچووك دابنێین، هەر پێیەك دەبێ بە دوو پایەو ئەو حەلە ئەم بازنەیە تەنیا دوو کێشی تێدا دەبێ (وافیر)و (کامیل). کێشە پشت گوێ خراوەکەی (مەتەوەففیر) دەر ناکەوێ.

٢- هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە شەش پێیە (٣ +٣).

٣- هەموو کێشەکانی ئەم بازنەیە لە دووبارەبوونەوەی یەك جۆرە پێ پێك هاتوون.(وافیر مفاعلتن، کامیل متفاعلن، موتەووەفیر فاعلاتك) ئەم جۆرە کێشە پێی دەگوترێ (کێشی ساف).

سەرنجی تایبەت بە کوردی:

١- کێشی وافیر لە کوردیدا بە پێی (مفاعلتن) نەکەوتۆتە بەر چاو. بەڵام مامۆستا مەلا عەبدولکەریم کێشی هەزەجی شەشی مەحزووف بە پێی عیللەو زیحافو بۆچوونی عەرەبی دەباتەوە سەر کێشی (وافیر).

٢- کێشی کامیل لە کوردیدا زۆر کەم بە کار هاتووە. هەمووی چوار پێنج شیعری پێ نووسراوە. (نالیو نالبەندو لوتفیو جزیریو بێخودو ئەحمەد موختار) یەکەو شیعریان پێ نووسیوە

بازنەی سێیەم (المجتلب - هاوردە):

بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە هەموو پێی کێشەکانی ئەم بازنەیە لە بازنەی یەکەمەوە هاتوون. (مفاعیلن) لە کێشی تەویلو (فاعلاتن) لە کێشی مەدیدو (مستفعلن) لە کێشی بەسیت.

١- کێشی هەزەج (الهزج - لەرە):

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

٢- کێشی رەجەز (الرجز - شلەژان):

مستفعلن مستفعلن مستفعلن فعلن مستفعلن مستفعلن

٣-کێشی رەمەل (الرمل - پەلە):

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن

سەرنج:

سەرنجی گشتی:

١- کیشێ هەزەج بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە لە لەرانەوەی دەنگ دەکا، واتە لە لەرانەوەو زایەلەی دەنگ دەچێ چونکە دوو سەبەبی سووکی لە دوای یەکتری لە دوای پایەی یەکەم هەیە کە وەتەدە ئەمەیش یارمەتی درێژبوونەوەی دەنگ دەدا، یان دەڵێن ئەمە لەرینەوەی گۆرانی تێدایەو هەزەجیش جۆرە گۆرانییەکە، بۆیە وای پێ دەگوترێ .

کێشی رەجەز بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە شلەژاوەو ئەمەیش لەو وشترەوە وەرگیراوە کە رانەکانی دەشلەژێن. یان بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە بۆی هەیە هەر پێیەکو دوو پیتی لێ لابدرێ. زۆر تووشی زیحافو عیللەو کەرت کردن(شەتر)و شەکەتیی (نهك)و کۆرت کردنەوە(جزء) دەبێو ئەمە لە هەموو کێشەکان زیاتر لە گۆڕاندایەو لەسەر حاڵەتێك سەقام ناگرێ.. یان دەڵێن لەبەر لێك نزیکی پێیەکانیو کەمی پیتەکانی وای پێ دەگوترێ. یان دەڵێن ئەم کێشە لە عەرەبیدا، بە زۆری بە مەشتووری واتە بە سێ پێیی هاتووەو بەمەوە لەو وشترەکە دەکا کە پێیەکی بەسرابێو بە سێ پێ مابێتەوە.

کێشی رەمەل بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە خێرا لە دەم دێتە دەرەوەو بە هۆی بە دوای یەکدا هاتنی پێی (فاعلاتن). رەمەل لە زماندا یانی پەلە کردن لە رۆیشتندا. رەمەلی تەواف باوە.

٢- ئەم بارنەیە سێ کێشی تێدایە. هەرسێکیان بە کار هاتوون. هیچ کێشی پشت گوێ خراوی تێدا نییە.

٣- هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە لە شەش پێ پێك هاتووە (٣ +٣).

٤- هەر یەکە لە کێشەکان لە دووبارە بوونەوەی یەك جۆرە پێ پێك هاتووە (هەزەج مفاعیلن، رەجەز مستفعلن، رەمەل فاعلاتن). ئەم جۆر کێشە پێی دەگوترێ ( کێشی ساف).

سەرنجی تایبەت بە کوردی:

١- هەر سێ کێشی ئەم بازنەیە لە کوردیدا بە کار هاتوون.

٢- کێشی هەزەج بە پلە یەك لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بە کار هاتووە. ٢١ قالب(لق)ی هەزەج لە کوردیدا بە کار هاتووە. ئەم کێشە بە هەموو لقەکانییەوە نزیکەی(٤٨٪)ی شیعری کوردی پێ نووسراوە.

٣- کێشی رەمەل لە کوردیدا بە پلەی دووەم دێ لە دوای هەزەج. رەمەلیش ٢١ قالب (لق)ی جیاجیای لە کوردیدا بە کار هاتووە. ئەم کێشە بە هەموو لقەکانییەوە نزیکەی (٣٩٪) شیعری کلاسیکی کوردی پێ نووسراوە.

٤- هەموو شاعیرانی کلاسیکی کوردی ئەم دوو کێشەیان بە کار هێناوە کە لە هەموو کێشەکان باوترن و بە هەردووکیان نزیکەی (٨٧٪)ی شیعری کوردیان پێ نووسراوە.

٥- کێشی رەجەز لە کوردیدا دوای هەزەج و رەمەل و موزاریع بە پلەی چوارەم دێ. ١٥ قالب (لق)ی رەجەز لە کوردیدا بە کار هاتووە. نزیکەی (٢،٤٪) شیعری کوردی پێ نووسراوە. ئەحمەدی کۆرو ئەسیری و باتەیی و جزیری و پەرتۆیی هەکاری و نالی و وەفایی و پیرەمێردو بەختیار زێوەرو نالبەندو... شیعریان پێ

نووسیوە. ئەوەی تێبینی دەکرێ ڕێژەی بە کارهێنانی کێشی ڕجەز لای شاعیرانی کرمانجی سەروو زیاترە تا لای شاعیرانی کرمانجی ناوەڕاست.

بازنەی چوارەم (المشتبە — لێ تێکچوون):

بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە ئیشتیباه هەیە لە نێوان (مستفعلن)ی بە وەتەدی کۆو (مستفع لن)ی بە وەتەدی بڵاو. هەروەها لە نێوان (فاعلاتن)ی بە وەتەدی کۆو (فاع لاتن)ی بە وەتەدی بڵاو. ئەو پێیانەی وەتەدیان جیایە هەر یەکە تایبەتە بە کێشەکانی خۆیەوە کە بە پێی پاش و پێش کردنی پایەکان لە یەك وەردەگیرێن.

١- کێشی سەریع (السریع- خێرا):

مستفعلن مستفعلن مفعولات  مستفعلن مستفعلن مفعولات

٢- کێشی موتتەئید (المتئد). پێیشی دەگوترێ (غەریب):

فاعلاتن فاعلاتن مستفع لن     فاعلاتن فاعلاتن مستفع لن

ئەم کێشە پشت گوێ خراوە.

٣- کێشی مونسەرید (المنسرد). (پێیشی دەگوترێ (قەریب):

مفاعیلن مفاعیلن فاع لاتن     مفاعیلن مفاعیلن فاع لاتن

ئەم کێشە پشت گوێ خراوە.

٤- کێشی مونسەریح (المنسرح — ئاسان):

مستفعلن مفعولات مستفعلن     مستفعلن مفعولات مستفعلن

٥- کێشی خەفیف (الخفیف - سووک):

فاعلاتن مستفع لن فاعلاتن     فاعلاتن مستفع لن فاعلاتن

٦- کێشی موزاریع (المضارع - پێچوو):

مفاعیلن فاع لاتن مفاعیلن     مفاعیلن فاع لاتن مفاعیلن

٧- کێشی موقتەزەب (المقتضب - بڕان):

مفعولات مستفعلن مستفعلن     مفعولات مستفعلن مستفعلن

٨- کیشی موجتەس (المجتث - دەرکشاو):

مستفع لن فاعلاتن فاعلاتن     مستفع لن فاعلاتن فاعلاتن

٩- کێشی موتەڕەد (المطرد). (پێیشی دەگوترێ (موشاکیل)

فاع لاتن مفاعیلن مفاعیلن     فاع لاتن مفاعیلن مفاعیلن

ئەم کێشە پشت گوێ خراوە.

سەرنج:

سەرنجی گشتی:

١- کێشی سەریع بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە دەربڕینی خێرایەو لە ناو بازنەی خۆیدا، لە هەر سێ پێ حەفت سەبەبی تێدایە.وەکوو دەشزانین سەبەب لە وەتەد خێراترە لە دەربڕیندا.

کێشی مەنسەریح بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە ئاسانە واتە لە سەر زمان سووکە.

کێشی خەفیف بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە لە هەموو حەفتییەکان سووکترە چونکە سێ سەبەبی سووکی بە دوای یەکدا دێنو سەبەبیش لە وەتەد سووکترە.

کێشی موزاریع بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە بە کیشی خەفیف دەچێ کە پێیەکی وەتەدی کۆیەو پێیەکەی تری وەتەدی بڵاوە، یان دەڵێن بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە لە بارەی پێو پێشکەوتنی سەبەب لە وەتەد بە کێشی هەزەج دەچێ، یان لەبەر ئەوەی بە کێشی مونسەریح دەچێ کە وەتەدی بڵاوی لە پێی دووەمدایە. یان بۆیە وای پی دەگوترێ چونکە لە حاڵەتی قەبزدا لە کێشی موجتەس دەکا.

کێشی مەقتەزەب بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە بە لابردنی پێی یەکەم لە کێشی مونسەریح براوە

کێشی موجتەس بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە بە لابردنی پێی یەکەمی لە کێشی خەفیف دەرکشاوە.

٢- ئەم بازنەیە نۆ کێشی تێدایە. شەشیان بە کارهاتوونو سیانیان پشت گوێ خراون.

٣ - هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە لە شەش پێ پێك هاتووە (٣ +٣).

٤- هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە لە دوو پێی جیاواز پێك هاتووە. پێیەکیان دوو جار هاتووەو پێیەکەی تر یەك جار. ئەم جۆرە کێشە پێی دەگوترێ کێشی تێکەڵاو. وەتەدی بڵاو لە سێ پێ (مفعولات، مستفع لن، فاع لاتن) هاتووە. هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە دوو وەتەدی بڵاوی تێدایە. هەر یە لە لەتێك.

٥- تەنیا لە کێشەکانی ئەم بازنەیەدا وەتەدی بڵاو دەردەکەوێ.

سەرنجی تایبەت بە کوردی:

١- ئەو سێ کێشەی لەم بازنەیەدا پشت گوێ خراون لە کوردیشدا نین.

٢- کێشی سەریع بە پلەی نۆیەم دێ لە کوردیدا. سەریع لە کوردیدا دوو قالب(لق)ی بە کار هاتووە. نزیکەی (٠٫٣٪)ی شیعری کوردی بەم کێشە نووسراوە. ئەسیری و جزیری و دەشتی و دڵزارو زێوەرو شێخ نووری و سابیری و فانی و کانی و وەفایی شیعریان پێ نووسیوە.

٣- کێشی مونسەریح لە کوردیدا بە دەگمەن شیعری پێ نووسراوە.

٤- کێشی خەفیف بە پلە پێنج هاتووە لە کوردیدا. پێنج قالب (لق)ی لێ بە کار هاتووە. نزیکەی (١٪) شیعری کوردی پێ نووسراوە. ئەسیری و ئاورەحمان بەگی بابان و بەختیار زێوەرو بێخودو پەرتۆیی هەکاری و تاهیر فوئادو جزیری و حاجی قادرو حەریق و حەقیقی و خادیم و رەمزی و زێوەرو سالم و سەفوەت و شێخ نووری و شێخ رەزاو قانیع و گۆران و مەلای گەورەو هێدی و... شیعریان پێ نووسیوە.

٥- موزاریع لە کوردیدا بە پلە سێ هاتووە دوای هەزەج و رەمەل. موزاریع لە کوردیدا شەش قالب (لق)ی لێ بە کار هاتووە. نزیکەی (٦٪)ی شیعری کوردی پێ نووسراوە. ئەحمەد موختار بەگ و ئەدەب و ئەسعەد مەحوی و ئەسیری و ئەورەحمان بەگی بابان و بەختیار زێوەرو جزیری و حاجی قادری کۆیی و حەریق و بێخودو پەرتۆیی هەکاری و پیرەمێردو تاهیر بەگی جاف و تاهیر فوئادو حەقیقی و حەمدی و خادیم و دەشتی و رەمزی و سالم و سەفوەت و شاکەلی و شاهۆو شێخ

نووریو شێخ ڕەزاو سابیریو فانیوقانیعو کۆکەییو کوردیو کەمالیو گۆرانو مەحویو نارییو نالیو ویسالیو... شیعریان پێ نووسیوە.

٦- کێشی موقتەزەب لە کوردیدا نەکەوتۆتە بەر چاو.

٧- کێشی موجتەس لە کوردیدا بە پلە شەش هاتووە. لە کوردیدا پێنج قالب (لق)ی موجتەس بە کار هاتووە. تزیکەی (٣،. ٪) شیعری کوردی بەم کێشە نووسراوە. ئەسیریو ئەورەحمان بەگو ئەدەبو بەختیار زێوەرو بێخودو حاجیو حەریقو خادیمو ڕەمزیو زێوەرو سەفوەتو شێخ نووریو شێخ ڕەزاو سابیریو گۆرانو مەحویو نالیو وەفاییو... شیعریان بەم کێشە نووسیوە.

<u>تێبینی:</u> کێشی موجتەس لە شیعری زاری کرمانجی سەروودا ناکەوێتە بەر چاو.

<u>بازنەی پێنجەم (المتفق - ڕێك).</u>

بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە پێی کێشەکانی ڕێکن واتە هەموویان پێی بچووکن (پێی پێنجی).

١- کێشی موتەقارەب (المتقارب- نزیك)

فعولن فعولن فعولن فعولن    فعولن فعولن فعولن فعولن

٢- کێشی موتارەك (المتدارك) پێشی دەگوترێ موحدەس یان خەبەب یان دق الناقوس.

فاعلن فاعلن فاعلن فاعلن    فاعلن فاعلن فاعلن فاعلن

سەرنج:

سەرنجی گشتی:

١- کێشی (موتەقارەب) بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە وەتەدو سەبەبەکانی لە یەك نزیکن، یان لەبەر ئەوەی پێیەکانی لە یەك نزیکن واتە بە یەك دەچن.

کێشی موتەداەك بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە گوایە ئەخفەش لە خەلیلی هەڵرتۆتەوە. واتە بەسەر خەلیلدا تێپەریوەو ئەخفەش دۆزیویەتەوە. یەکێ سەرەتاکانی بەرنامەی عەرووزو فەرهەنگی خەلیل بزانێ، دەزانێ شتی وا راست نییە.

٢- ئەم بازنەیە دوو کێشی تێدایەو هەردووکیان بە کار هاتوون.

٣- هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە لە هەشت پێ پێك هاتووە (٤ +٤)

٤- هەر یەکە لە کێشەکانی ئەم بازنەیە لە دووبارە بوونەوەی یەك جۆرە پێ پێك هاتووە. ئەم جۆرە کێشە پێی دەگوترێ کێشی ساف.

سەرنجی تایبەت بە کوردی:

١- کێشی موتەقارەب لە کوردیدا، بە پلە حەفت هاتووە. چوار قالب (لق)ی موتەقارەب لە کوردیدا هەیە. نزیکەی (١٪)ی شیعری کوردی پێ نووسراوە. ئەسیریو ئەدەبو بەختیار زێوەرو پیرەمێردو حاجیو حەمدیو خادیمو دەشتیو دلزارو سەفوەتو شاهۆو سابیریو سافیو فانیو قانیعو کەمالیو گۆرانو نالبەندو وەفاییو... شیعریان پێ نووسیوە.

٢- کێشی موتەدارەك لە کوردیدا بە دەگمەن دەکەوێتە بەر چاو.

پۆلین کردنی کێشەکان:

ئەو کێشانەی لە ناو ئەو بازنانەدا هاتوون بە سێ جۆر پۆلین دەکرێن:

١- پۆلین کردنی کێشەکان بە پێی بە کار هاتنیانەوە:

ئەلف - کێشی بەکار هاتوو وەکوو تەویلو بەسیتو مەدیدو وافیرو کامیلو هەزەجو رەجەزو رەمەلو سەریعو مەنسەریحو خەفیفو موزاریعو موقتەزەبو موجتەسو موتەقارەبو موتەدارەك.

ب - کێشی پشت گوێ خراو وەکوو موستەتیلو مومتەددو موتەوەففیرو موتتەئید(غەریب)و مونسەرید(قەریب)و موشاکیل(موتوڕڕەد).

٢- پۆلین کردنی کێشەکان بە پێی جۆری پێیەکانەوە:

ئەلف - کێشی ساف: ئەو کێشانەن کە لە دووبارەبوونەوەی یەك پێ دروست دەبن وەکوو کێشەکانی بازنەی دووەمو بازنەی سێیەمو بازنەی پێنجەم: (وافیر: مفاعلتن، کامیل: متفاعلن، هەزەج: مفاعیلن، رەجەز: مستفعلن، رەمەل: فاعلاتن، موتەقارەب: فعولن، موتەدارەك: فاعلن).

ب - کێشی دەوری: ئەو کێشانەن کە لە دوو پێی جیاواز پێك هاتوونو پێیەکان بە نۆرە یەك لە دوای یەك دووبارە دەبنەوە وەکوو کێشەکانی بازنەی یەکەم.

ج - کێشی تێکەڵاو: ئەو کێشانەن کە لە دوو پێی جیاواز دروست دەبن. پێیەکیان یەك جار دێ لە نیوە دێرێداو پێیەکەی تر دوو جار، وەکوو پێیەکانی بازنەی چوارەم.

٣- پۆلین کردنی کێشەکان بە پێی ژمارەی پێیەکان:

ئەلف - کێشی هەشت پێی وەکوو کێشەکانی بازنەی یەکەمو بازنەی پێنجەم. (تەویلو بەسیتو مەدیدو موتەقارەبو موتەدارەك)

ب - کێشی شەش پێی وەکوو کێشەکانی بازنەی دووەمو سێیەمو چوارەم ( وافیرو کامیلو هەزەجو رەجەزو رەمەلو سەریعو مەنسەریحو خەفیفو موزاریعو موقتەزەبو موجتەس ).

شی کرنەوەی بازنەی عەرووزیی

تەنیا یەك بازنە (بازنەی سێیەم) وەردەگرینو چونیەتی لە یەك وەرگرتنی کێشەکان روون دەکەینەوە. بۆ وەرگرتنی کێشێك لە کێشێکی تر، ئەم هەنگاوانە پەیرەو دەکەین:

١- دەتوانین یەکەم جار هەر کێشێك وەر بگرین بەڵام وا چاکە بەهێزترین کێش وەربگرین وەك لە ناو بازنەکەدا هاتووە. لێرەدا کێشی هەزەج وەردەگرینو پێیەکانی دەنووسینەوە:

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

٢- یەکەم پایە(روکن)ی پێی یەکەم دەگوازینەوە بۆ کۆتایی پێی هەرە دواوە:

X

مفا/عیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن/مفا

واتە دەبێ بە:

عیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفا

٣- ئێستا لە پێی دووەمەوە پایە(روکن)ی یەکەمی هەموو پێیەکان دەدەینە پێی پێشەوەی خۆیان. بەم جۆرە:

عیلن مفا/ عیلن مفا/ عیلن مفا/ عیلن مفا/عیلن مفا/عیلن مفا

٤- ئێستا نیشانەی برگە بۆ پێیە نوێیەکان دەنووسین:

عیلن مفا/ عیلن مفا/ عیلن مفا// عیلن مفا/عیلن مفا/عیلن مفا

U-- /-- -- U-- /-- -- U -- // -- -- U-- /-- -- U-- /-- -- -- --

—U

٥- ئەم نیشانانە دەکەینەوە بە پێی تازە بە گوێرەی ریزبوونی برگەی کورت و درێژ. لێرەدا هەموویان بەرامبەر (مستفعلن-- -- U—)دەوستن. کەواتە پێیە نوێکان بەم جۆرەیان لێ دێ:

مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن

شەش جار (مستفعلن). ئەمەیش کێشی رەجەزە. واتە کێشی رەجەزمان لە کێشی هەزەج وەرگرت.

بۆ وەرگرتنی کێشێکی تر لە رەجەز هەمان هەنگاوەکانی پێشوو پەیرەو دەکەین:

١- کێشی رەجەز وەردەگرین و پێیەکانی دەنووسیتەوە:

مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن

٢- پایە(روکن)ی یەکەمی پێی یەکەم دەگوازینەوە بۆ کۆتایی پێی هەرە دواوە:

X

مس/تفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن/مس

واتە دەبێ بە

تفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن مس

٣- ئێستا لە پێی دووەمەوە، پایە(روکن)ی یەکەمی هەموو پێیەکان دەدەینە پێی پێشەوەی خۆیان. بەم جۆرە:

تفعلن مس/تفعلن مس/تفعلن مس// تفعلن مس/تفعلن مس/تفعلن مس

٤- ئێستا نیشانەی برگە بۆ پێیە نوێیەکان دەنووسین:

تفعلن مس/تفعلن مس/تفعلن مس// تفعلن مس/تفعلن مس/تفعلن مس

U -- -- /-- U -- -- /-- U -- -- // -- U -- -- /-- U -- -- /-- U -- -- --

٥- ئەم نیشانانە دەکەینەوە بە پێی تازە بە گوێرەی ریزبوونی برگەی کورتودرێژ. لێرەدا هەموویان بەرامبەر (فاعلاتن -- U -- --) دەوستن. کەواتە پێیە نوێکان بەم جۆرەیان لێ دێ:

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن

شەش جار (فاعلاتن). ئەمەیش کێشی رەمەلە. واتە کێشی رەمەلمان لە کێشی رەجەز وەرگرت.

بۆ وەرگرتنی کێشێکی تر لە رەمەل هەمان هەنگاوەکانی پێشوو پەیڕەو دەکەین

١- کێشی رەمەل وەردەگرین و پێیەکانی دەنووسیتەوە:

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن

٢- پایە(روکن)ی یەکەمی پێی یەکەم دەگوازینەوە بۆ کۆتایی پێی هەرە دواوە:

X

فا/علاتن فاعلاتن فاعلاتن      فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن/ فا

واتە دەبێ بە:

علاتن فاعلاتن فاعلاتن      فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فا

٣- ئێستا لە پێی دووەمەوە، پایە(روکن)ی یەکەمی هەموو پێیەکان دەدەینە پێی پێشەوەی خۆیان. بەم جۆرە:

علاتن فا/علاتن فا/علاتن فا//      علاتن فا/علاتن فا/علاتن/فا

٤- ئێستا نیشانەی برگە بۆ پێیە نوێیەکان دەنووسین:

علاتن فا/ علاتن فا / علاتن فا //      علاتن فا/ علاتن فا /علاتن/فا

U / -- -- --U / -- -- --U      // -- -- --U / -- -- --U / -- -- --U-- -- --

٥- ئەم نیشانانە دەکەینەوە بە پێی تازە بە گوێرەی ریزبوونی برگەی کورت و درێژ. لێرەدا هەموویان بەرامبەر(مفاعیلن U-- -- --) دەوستن. کەواتە پێیە نوێکان بەم جۆرەیان لێ دێ:

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن      مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

شەش جار (مفاعیلن). ئەمەیش کێشی هەزەجە. واتە کێشی هەزەجمان لە کێشی رەمەل وەرگرت. یانی گەڕاینەوە سەر کێشی یەکەم.

ئەگەر بەم جۆرە بەردەوام بین، لە ناو ئەو بازنەیەدا دەخولێینەوە. لە هەزەجەوە بۆ ڕەجەز. لە ڕەجەزەوە بۆ ڕەمەل. لە ڕەمەلەوە دووبارە بۆ هەزەج. دیسان هەمان شت دووبارە دەبێتەوە. لەو سێ کێشە (هەزەج، ڕەجەز، ڕەمەل) زیاتر دەرناچێ.

ئەمەش بازنەکە بە وێنە




- کەوانە گەورەکانی ناوەوە سەرەتای کێشەکانن
- کەوانە بچووکەکانی دەرەوە ڕیزی پێیەکانن

[ لە کتێبی : فن التقطیع الشعری والقافیة د. صفاء خلوصی ل ١٢٩ .]

وێنەی بازنەی عەرووزیی سێیە

# بەشی دووەم

# کێشە باوەکانی عەرووز لە کوردیدا

لێرەدا کێشەکان بە پێی ریزی ناو بازنەو کێشەکانی ناویان وەرناگرین، بە گوێرەی زۆر بەکارهاتنیانەوە وەریان دەگرین. باوترین کێشی عەرووزی لە کوردیدا ئەمانەن:

## یەکەم: کێشی هەزەج:

کێشی هەزەج لە بازنەی سێیەمدایەو پێیەکانی لەناو بازنەی خۆیدا ئەمانەن.

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

واتە هەر دێرێکی شەش پێیە (٣ +٣). دەشێ بە کورتکراوەیی (مجزوء) بە کار بێ واتە ببێ بە چوار پێ (٢ +٢). هەروەها دەشێ بە زیادکراویش بە کار بێ. بە هەشت پێیی (٤ +٤)و بە کەمیش بە دە پێ هاتووە (٥+٥). هەزەج لە کوردیدا، ٢١ قالب واتە لقی جیاجیای هەیە: لێرەدا هەرە باوەکانیان وەردەگرین.

کێشی هەزەج لەکوردیدا ئەم گۆڕانانە وەردەگرێ:

مفاعیلن: تەسبیغ مفاعیلان.

کەف مفاعیلُ

قەسر مفاعیلْ

قەبز مفاعلن

خەرب فاعیلُ (مفعولُ)

حەزف مفاعی (فعولن)

## قالب (لق)ە کێشە باوەکانی هەزەج لە کوردیدا:

**١- هەزەجی هەشتی موسەببەغ: (٣٢ ÷ ٢= ١٦ = ٤،٤،٤،٤)**

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

= = = موسەببەغ

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

= = = موسەببەغ

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان

| مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلان |
|---|---|---|---|
| U-- -- -- | U-- -- -- | U-- -- -- | U-- -- -- . |
| ٤ | ٤ | ٤ | ٤ |
| ١٦ | | | |

| مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلان |
|---|---|---|---|
| U-- -- -- | U-- -- -- | U-- -- -- | U-- -- -- . |
| ٤ | ٤ | ٤ | ٤ |
| ١٦ | | | |

هەمووی ٣٢ بڕگەیە

دوو عەرووزی هەیە:

١- موسەببەغ (مفاعیلان) وەکوو زەربەکەی.

٢- تەواو--سالم (مفاعیلن)

نموونە:

- موحیتی عاریزی دڵبەر لە ســەر روو زولفی پڕ چین هات

بە دەوری باغی گوڵدا تەرزی سونبول مەحزی پەرژین هات (سالم ٤٦)

شیکردنەوە:

مو/حی/تی/عا//ری/زی/دڵ/بەر//لە/سەر/روو/زول//فی /پڕ/چین/ هات

-- -- -- -- // U -- -- -- U// -- -- -- // U-- -- -- U

مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلان

بە/ دەو/ری/ با//غی/ گوڵ/دا/ تەر//زی/ سون/بول/مەح//زی/ پەر/ژین/ هات

.-- -- -- -- // U-- -- -- U // -- -- - U // -- -- -- U

مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلان

کێشی هەزەجی هەشتی موسەببەغ.

لێرەدا عەروزو زەرب هەردووکیان موسەببەغن (مفاعیلان). لەم قالبە کێـشەدا، زەرب هەر دەبێ موسەببەغ (مفاعیلان) بێ بەڵام عەرووز بۆی هەیە ببـێ بـە سـالم

(مفاعیلن). لەم حاڵەتەدا، لە دوای ناوی کێشەکە، ئەم تێبینییە دەنووسین: (عەرووزەکەی سالمە).

- ئەمەیش نموونەیەك بۆ عەرووزی تەواو - سالم:

گەلێکم بیستووە پەستیو بڵندی دەو//لەتان ئەمما

سالم مفاعیلن

جیهان نەیدیوە پەستی وا میسالی حاڵی کوردستان (حاجی ٩١)

لێردا دیارە عەرووزەکە تەواوە (مفاعیلن).

ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شییان بکەوە:

هەموو ئەندامی گوڵ گوێیە لە رۆژێکی کە ئەو شۆخە

لە گوڵشەن هەروەکوو غونچە دەمی پشکووتو ناوی برد (حەمدی ٢١٧)

ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختییایە هەلهەلەی مەخلووق

لە دەوری نەعشییا سبحەی دەبینی وەلوەلەی مەخلووق (مەحوی ١٨٠)

ب دل ئیرۆ خەدەنگم ئەز ژ مەکرا وان دو سولتانان

ب تەبعی خوەش بچووکم ئەز ب گریانم شەبستانان (باتەیی١٦٨)

قەلەم قوربانی نووکت بم دە بێرە فەسحەتو گفتار

وەکوو حاتەم دەبشکێنە خەزێنەی جەوهەری ئەسرار (قانع ١١٧)

ئەگەر حەتتا قیامەت ئەز بکم هەژمارو بنڤیسم

ژ عصیانا کو دێ رەش بن هەزاران دەفتەرو تۆمار (پەرتۆ ١٩٥)

## ٢– هەزەجی هەشتی تەواو –– سالم: (٣٢÷٢= ١٦ =٤، ٤، ٤، ٤)

**مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**

**مفاعیلن فاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**

| مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن |
|---|---|---|---|
| – –– ––U<br>– | –– –– ––U | –– –– ––U | –– –– ––U |
| ٤ | ٤ | ٤ | ٤ |
| ١٦ | | | |

| مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن |
|---|---|---|---|
| –– –– ––U | –– –– ––U | –– –– ––U | –– –– ––U |
| ٤ | ٤ | ٤ | ٤ |
| ١٦ | | | |

**هەمووی ٣٢ برگەیە**

**دوو عەرووزی هەیە:**

**١– تەواو –– سالم وەکوو زەربەکەی**

**٢– موسەببەغ (مفاعیلان)**

نموونە:

ب ناریٚ فرقەتیٚ صوهتم ژ فەرقی سەر حەتا پێدا

خەدەنگا غەفلەتیٚ نوهتـــم ژ بەرقا لامیعــا تێدا (جزیری ٤١)

شیکردنەوە:

ب/ نا/ریٚ/ فر//قە/تیٚ/ صوه/تم// ژ /فەر/قی/ سەر// حە/تا/ پیٚ/دا

-- -- -- // U -- -- -- U// -- -- -- // U-- -- -- U

مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلن

خە/دەن/گا/ غەف//لە/تیٚ/ نوه/تم// ژ/ بەر/قا/ لا//می/عا/ تیٚ/دا

-- -- --// U -- -- -- U// -- -- --// U-- -- -- U

مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلن // مفاعیلن

کێشی هەزەجی هەشتی تەواو.

لێـرەدا عــەرووزو زەرب هــەردووکیان تــەواو-- ســالمن. لــەم قالــە کێـشەی هەزەجدا، زەرب هەر دەبیٚ تەواو -- سالم بـیٚ بـەڵام عـەرووز دەشـیٚ تـەواو -- سالم بیٚ هەروەکوو دەشیٚ موسەببەغ بیٚ.

نموونەیەك بۆ عەرووزی موسەببەغ:

لە دووری تۆیە ئەی خورشیدی پرتەوبەخ//شی شەوگەردان

موسەببەغ مفاعیلان

کە نالی وا لە حاڵاتی مەحاقی نیوەشەودایە (نالی ١١٣)

لێرەدا وەکوو دیارە عەرووزەکە موسەببەغە (مفاعیلان).

ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شیبیان بکەوە:

کڵاولار گورجی کەو رەفتار نەزەر ناکەی ئەڕۆی تۆغر
لە تیری ئاهی نـــاکـــامیم حـەزەر ناکەی ئەڕۆی تۆغر (گۆران ٦٣)

ژ شەوقیْ ئەبروان بنمێت هیلال دیســـا د قەوسەینان
ژ خـاوەر بێتـــە دەر خورشید زەلام وەر بت د نووڕێدا (جزیری٤٤)

هجوومیان کرد رەقیبان وەك رەوی سەگ دەوریان لێدام
مـــەگـــەر شمشێری ئەبرۆی ئەو بکا ئێستاکـــە چاری من
(ئەحمەد موختار ٩٩)

دلا قەت نینە مەحبووبەك ژ تە جوزئەك نەبت لالی
دلارامە نە مەجزووبەك هـــەیـــە سرڕا تی ژێ خالی (خانی، ٢، ٣١١)

بە سەر سامی لە سەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم
شریتی عومری رابردووم وەکوو خـــەو دێتـــە بـەر چاوم (هەردی ٥٨)

## ٣- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور:

(٢٨÷٢= ١٤ =٣،٣،٤،٤)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب مەکفووف مەکفووف مەقسوور

فاعیلُ مفاعیلُ مفاعیلُ مفاعیلْ

مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولان

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب مەکفووف مەکفووف مەقسوور

فاعیلُ مفاعیلُ مفاعیلُ مفاعیلْ

مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولان

| مفعولُ | مفاعیلُ | مفاعیلُ | فعولان |
|---|---|---|---|
| U --- --- | U-- --U | U-- -- U | . -- --U |
| ٣ | ٤ | ٤ | ٣ |
| ١٤ | | | |

| مفعولُ | مفاعیلُ | مفاعیلُ | فولان |
|---|---|---|---|
| U --- --- | U-- --U | U-- -- U | . — --U |
| ٣ | ٤ | ٤ | ٣ |
| ١٤ | | | |

هەمووی ٢٨ بڕگەیە

دوو عەروزی هەیە:

١- مەقسوور (فعولان) وەکوو زەربەکەی

٢- مەحزووف ( فعولن)

نموونە:

ئەی سەروی بڵند قەددو برۆ تاقو مەمك جووت

کێ دەستی دەگاتە بەیو ناری نەگەیشتووت (نالی ٦٠)

شیکردنەوە:

ئەی/ سەر/وی// ب/ڵند/ قەد/دو// ب/رۆ/تا/قو// مە/مك/ جووت

-- -- U // U -- -- U // U-- -- U // U -- -- -- .

مفعولُ // مفاعیلُ // مفاعیلُ // فعولان

کێ/ دەس/تی// دە/گا/تە/ بە//یو/ نا/ری/ نە//گە/یش/تووت

-- -- U // U -- -- U // U -- -- U // U -- -- -- .

مفعولُ // مفاعیلُ // مفاعیلُ // فعولان

کێشی هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور.

لێرەدا عەرووزو زەرب هەردووکیان مەقسوورن (فعولان). لەم قالبە کێشەی هەزەجدا، زەرب هەر دەبێ (مەقسوور) بێ بەڵام عەرووز دەشێ مەقسوور (فعولان) بێ هەروەکوو دەشێ مەحزووف (فعولن) بێ.

نموونەیەك بۆ عەرووزی مەحزووف:

دوێنێ نەفەسم بوو بە عەتارخانە//ی<u>ی چینی</u>

مەحزووف فعولن

هێنای کە سەبا نامەیی مشکینی وەفاتان ( بیخود ٦١)

ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شییان بکەوە:

دەستێ مە سەحەر گرتو برین سەیری حەبیبێ

فیلحال رەقیبی ژ حەســەد لــەرزەوو تـــا گرت (جزیری ٩١)

ساقی وەرە رەنگین کە بە پەنجە لەبی ئەقداح

بەم راحە لە سەر راحە دەڵێن راحەتی ئــەرواح (نالی ٦٠)

جانێ خوە مە کر دانەیی داڤــا کــو ڤــەدایی

ئاهوو سیفەت ئەو پێ حەسیا راهی خەتا گرت (جزیری ١١٧)

فەرموویە کە من پادشەهی حوسنی دڵارام

خورشیدو مەهن ئاینەداری روخـــی زیبـــام (وەفایی٤٦)

هەر کەس سەحەرێ تالیبی تشتەك ب چەمەن هات

هن سووسنو هـن سـونبـولو هـن زولفی دوتـــا گرت (جزیری ١١٨)

## ٤– هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف:

(٢٨÷٢=١٤= ٣،٤،٤،٣)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب مەکفووف مەکفووف مەحزووف

فاعیلُ مفاعیلُ مفاعیلُ مفاعی

مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب مەکفووف مەحزووف

فاعیلُ مفاعیلُ مفاعیلُ مفاعی

مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن

| مفعولُ | مفاعیلُ | مفاعیلُ | فعولن |
|---|---|---|---|
| --- --- U | U-- --U | U-- -- U | -- --U |
| ٣ | ٤ | ٤ | ٣ |
| ١٤ | | | |

| مفعولُ | مفاعیلُ | مفاعیلٌ | فعولن |
|---|---|---|---|
| --- --- U | U-- --U | U-- -- U | -- --U |
| ٣ | ٤ | ٤ | ٣ |
| ١٤ | | | |

هەمووی ٢٨ بڕگەیە

دوو عەروزی هەیە:

١- مەحزووف (فعولن) وەکوو زەربەکەی

٢- مەقسوور ( فعولان)

نموونە:

ئەشکالو خەتین دائیرەیی نوقتەیی عیلمن

ئەڤ نەقشو میسالێن د خەیاڵاتی عەدەمدا (جزیری ٨)

شیکردنەوە:

ئەش/کا/ل‌و// خە/تین/ دا/ئی//رە/یی/ نوق/تە//یی/ عیل/من

-- -- U // U -- -- U // U-- -- U // U -- --

مفعولُ // مفاعیلُ // مفاعیلُ // فعولن

ئەڤ/ نەق/ش‌و//می/سا/لێن/د// خە/یا/ڵا/تی// عە/دە‌م/دا

-- -- U // U -- -- U // U-- -- U // U -- --

مفعولُ // مفاعیلُ // مفاعیلُ // فعولن

کێشی هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

لێرەدا عەرووزو زەرب هەردووکیان مەحزووفن (فعولن).

لەم قالە کێشەی هەزەجدا، زەرب هەر دەبێ (مەحزووف) بێ بەڵام عەرووز هەروەکوو دەشێ مەحزووف (فعولن) بێ دەشێ مەقسوور (فعولان) بێ.

نموونەیەك بۆ عەرووزی مەقسوور (فعولان):

وا زەن مەبە روخسارەیی تۆ غائی//<u>بە قوربان</u>

مەقسوور فعولان

بنوارە چلۆن نەقشە لە نێو دیدەیی تەڕما (نالی ٥٠)

لێرەدا وەکوو دیارە عەرووزەکەی مەقسوورە.

ئەم دێڕە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شییان بکەوە:

ئەستێرە هەموو مەحوە لە نێو نووری قەمەردا
یا شەمسی جەمالت شەوی گێڕاوە بـە فـەردا (نالی ٥)

ئەی ئائینەئی دل ب جەمالا تـە موجـەللا
سەد سەفحە ب یەك زەڕڕە ژ نوورا تە موتەللا (خانی، ٢، ٨٣)

هێند مونتەزیری تۆ بوو هەتا چـاوی سپی بوو
نێرگز کە لە سەر یەك قەدەمو دیدە چەقی بوو (حاجی ٨٩)

گەر لوئلوئی مەنسوور ژ نەزمێ تە دخـوازی
وەر شیعری مەلێ بین تە ب شـیراز ژ حـاجەت (جزیری ٩٤)

لـەو ڕۆژەوە ڕۆیشتـووە تـۆراوە دڵـی مـن
هەر چەند ئەگەڕێم بێ سەرو شوێن ماوە دڵی من (بێخود ٦٦)

## ٥- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی موسەببەغ:

(٢٨÷٢=٤،٣، ٣، ٤)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب = ئەخرەب موسەببەغ

فاعیلُ فاعیلُ مفاعیلان

مفعولُ مفاعیلن مفعولُ مفاعیلان

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب = ئەخرەب موسەببەغ

فاعیلُ          فاعیلُ   مفاعیلان

مفعولُ   مفاعیلن   مفعولُ   مفاعیلان

| مفعولُ | مفاعیلن | مفعولُ | مفاعیلان |
|---|---|---|---|
| U --- --- | -- -- --U | U -- -- | . -- -- --U |
| ٣ | ٤ | ٣ | ٤ |
| ١٤ | | | |

| مفعولُ | مفاعیلن | مفعولُ | مفاعیلان |
|---|---|---|---|
| U --- --- | -- -- --U | U -- -- | . -- -- --U |
| ٣ | ٤ | ٣ | ٤ |
| ١٤ | | | |

دوو عەرووزی هەیە:          هەمووی ٢٨ بڕگە

١- موسەببەغ (مفاعیلان) وەکوو زەربەکەی

٢- تەواو – سالم (مفاعیلن)

نموونە:

موستەغریقی عیسیانم بێ بەهرە لە تاعەت خۆم

شەرمەندە لەقاپی حەق ڕووزەردوخەجالەت خۆم          (مینە ٥٠)

شیکردنەوە:

موس/تەغ/ری//قی/ عیس/یا/نم// بێ/ بەھ/رە//لە/ تا/عەت/خۆم

-- -- U // U -- -- U // -- -- -- U // U -- -- -- .

مفعولُ // مفاعیلن // مفعولُ // مفاعیلان

شەر/مەن/دە //لە/قا/پی/ حەق// روو/ زەر/دو//خە/جا/لەت/ خۆم

-- -- U // U -- -- U // -- -- -- U // U -- -- -- .

مفعولُ // مفاعیلن // مفعولُ // مفاعیلان

کێشی ھەزەجی ھەشتی ئەخرەبی موسەببەغ.

نموونەیەك بۆ عەرووزی تەواو -- سالم:

شان کەوتوو لە ژێر باری کرداری// پڕو پووچا

سالم مفاعیلن

ئەڤگەندەسەری ڕۆژی دیوانی شەفاعەت خۆم (مینە ٥٠)

لێرەدا عەرووزەکەی تەواوە- سالمە (مفاعیلن)

ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر ھەمان قالبەکێشن، شییان بکەوە:

قوربان لە غەما فەوتام فەوتام لە غەمـــا قوربان

زیندان بووەتە قەسرم قەسرم بووەتـــە زینـدان (موخلیس دووسەرەیی)

فەخری عەرەبو تورکو کوردوو میلەلی تر بـووی

ھەم بێ ڕوخو بێ شاھو ئەسپوو فەرەست کردین ( دەشتی ١٢٤)

ڕۆژێ کە ئەڵێن مینە نامەی عەمەلت بینە

بێ نییەتی ڕەفتارو پڕ جورمو جەفاکارخۆم (مینە ٥٠)

وا هاتەوە ئەی یاران ئاشووبی دڵەفگاران

مست از میو میخواران از نرگس مستش مست (حەمدی ٣٣٠)

ئەی شاهی سلێمانی بێ بابو کەست کردین

بۆ لەو دەمە یەکجاری بێ خزمو کەست کردین (دەشتی ١٢٤)

## ٦- هەزەجی هەشتی ئەخرەب:

(٢٨÷٢=١٤=٤،٣،٤،٣)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب = ئەخرەب =

فاعیلُ = فاعیلُ

مفعولُ مفاعیلن مفعولُ مفاعیلن

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب = ئەخرەب =

فاعیلُ = فاعیلُ

مفعولُ مفاعیلن مفعولُ مفاعیلن

| مفعولُ | مفاعیلن | مفعولُ | مفاعیلن |
|---|---|---|---|
| --- --- U | - -- --U - | -- -- U | -- --U -- |
| ٣ | ٤ | ٣ | ٤ |
| ١٤ | | | |

| مفعولُ | مفاعیلن | مفعولُ | مفاعیلن |
|---|---|---|---|
| U --- --- | -- -- --U | U -- -- | -- -- --U |
| ٣ | ٤ | ٣ | ٤ |
| ١٤ | | | |

هەمووی ٢٨ بڕگە

دوو عەرووزی هەیە:

١- تەواو – سالم (مفاعیلن) وەکوو زەربەکەی

٢- موسەببەغ (مفاعیلان)

نموونە:

نەق/قا/شی// ئە/زە‌ل/ ڕۆ/ژا// سەر/ لە‌و/حە//یی/ ڕە‌ن/گین/ دا

-- -- -- U // U -- -- -- // -- -- U // U -- --

مفعولُ // مفاعیلن // مفعولُ // مفاعیلن

پەر/گا/ری// د/دەس/تان /بۆ// سەر/ سوخ/مە// کو/ تەز/یین/ دا

-- -- -- U // U -- -- -- // -- -- U // U -- --

مفعولُ // مفاعیلن // مفعولُ // مفاعیلن

نموونە بۆ عەووزی موسەببەغ (مفاعیلان):

چاویشی لە نالی کرد دینو د//ڵو جانی برد

موسەببەغ مفاعیلان

گەر زولفە ئەگەر نازە گەر خەندەیە گەر چاوە (نالی ١٠٠)

ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شییان بکەوە:

بۆ سەرویی خـــەرامـــانت وەك قومری دەنـــاڵێنم

وەك قومری دەنـــاڵێنم بۆ ســـەرویی خـــەرامـــانت ( بێخود ١٦)

ما سەجدە تەنێ من بر بەر سوورەتی مەحبووبـــان

ئیبلیسی نەبر ســـەجدە لـــەو مـــایە د نفریـــن دا (خانی،٢، ٣٠)

عیشقت کە مەجازی بێ خواهـــش مـــەکە ئیللا کـــچ

شـــیرین کچو لـــەیـــلا کچ ســـەلمـــا کچوعەزرا کـــچ (نالی ١٣٧)

دوو دیـــدەیی مـــەخمـــووری غـــارەتگەری ئیمـــانە

بـــۆ زولفی پەرێشـــانت حـــاڵم چـــە پـــەرێشـــانە (موختار ١٣٠)

وان جوملە ئەنەلحەق گۆت من واحیدی موتلەق گۆت

ســـاقی بخوە ئەز گرتم جامـــا مـــەیی نۆشـــین دا (خانی،٢، ٣١)

### ٧- هەزەجی شەشی مەقسوور: (٢٢÷٢=١١=٣،٤،٤)

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن

= = مەقسوور

= = مفاعيلْ

مفاعيلن مفاعيلن فعولان

مفاعيلن مفاعيلن مفاعيلن

= = مەقسوور

= = مفاعيلْ

مفاعيلن مفاعيلن فعولان

| مفاعيلن | مفاعيلن | فعولان |
|---|---|---|
| U -- -- -- | U -- -- -- | U -- -- . |
| ٤ | ٤ | ٣ |
| ١١ | | |

| مفاعيلن | مفاعيلن | فعولان |
|---|---|---|
| U -- -- -- | U -- -- -- | U -- -- . |
| ٤ | ٤ | ٣ |
| ١١ | | |

هەمووی ٢٢ برگە

دوو عەرووزی هەیە:

١- مەقسوور (فعولان) وەکوو زەربەکەی

٢- مەحزووف (فعولن)

نموونە:

هەڵی کەی بەیرەقی کوردی لە دەوران

لە مابەینی کەکۆن‌و هەیبە سولتان (حاجی٢٤٧)

شیکردنەوە:

هە/ڵی/ کەی/ بەی//رە/قی/ کوردی// لە/ دەو/ران

U // -- -- -- U // -- -- -- U-- --- -- .

مفاعیلن // مفاعیلن // فعولان

لە/ ما/بەی/نی// کە/کۆ/ن‌و/ هەی//بە/ سول/تان

U // -- -- -- U // -- -- -- U-- --- -- .

مفاعیلن // مفاعیلن // فعولان

کێشی هەزەجی شەشی مەقسوور.

نموونە بۆ عەرووزی مەحزووف (فعولن):

مەکەن لۆمەی پەشێوی دڵ //کە ئەمشەو

مەحزووف فعولن

پەشێواوە لە بەر پەرچەم پەشێوان (نالی ٣٢٢)

ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شییان بکەوە:

ئیلاهی نێرگزا مەی مەســتو نــازك

ژ دەستی خـوارو بەدخواهــان بپـارێز (جزیری ١٥١)

ئەگەر دەستم دەگاتـە گۆیی پوسـتان

دەکەم گۆی مـەتلەبم بیرون لە مەیدان (سالم ٨٩)

تنێ فەرهاد دزانت لـــەززەتی عیشـق

کو وی جــان دایـە شیرینێ نـە پەروێز (جزیری ٢٥١)

لە خۆم ئــاگر هـەڵێنم وەك چنــارۆك

لە چاوم گریە دەر بێ وەك حـەمــامۆك (حاجی ٢٤٧)

م دی نەقشەك ژ نەقشێ نەقشەبەندان

ڤەبوو قەیدێ د من یەك یەك ژ زەنــدان (خانی،٢، ٢٤٦)

٨- هەزەجی شەشی مەحزووف: (٢٢÷٢=١١=٣،٤،٤)

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

- - مەحزووف

- - مفاعی

مفاعیلن مفاعیلن فعولن

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

- - مەحزووف

- - مفاعی

مفاعیلن مفاعیلن فعولن

| مفاعیلن | مفاعیلن | فعولن |
|---|---|---|
| U -- -- -- | U -- -- -- | U -- -- |
| ٤ | ٤ | ٣ |
| ١١ | | |

| مفاعیلن | مفاعیلن | فعولن |
|---|---|---|
| U -- -- -- | U -- -- -- | U -- -- |
| ٤ | ٤ | ٣ |
| ١١ | | |

هەمووی ٢٢ بڕگە

دوو عەرووزی هەیە:

١- مەحزووف (فعولن) وەکوو زەربەکەی

٢- مەقسوور (فعولان)

نموونە:

دەما هاتی دو سێ فنجان ددەستدا

ڤەخواری من مەیو ئاڤا موبارەك (داهی٦٠)

شیکردنەوە:

دە/ما/ ها/تی// دو/ سێ/ فن/جان//د/دەست/دا

-- --U -- -- -- // U -- -- -- // U

مفاعیلن // مفاعیلن // فعولن

ڤە/خوا/ری/ من// مە/ی/و/ ئا/ڤا// مو/با/رەك

-- --U -- -- -- // U -- -- -- // U

مفاعیلن // مفاعیلن // فعولن

کێشی هەزەجی شەشی مەحزووف

نموونە بۆ عەرووزی مەقسوور:

بە دنیا دڵ مەبەستن ئەی ڕەفیقان

مەقسوور فعولان

گەلێ دامادی دی ئەم پیرە زالە (موختار١٤٥)

**ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شیبیان بکەوە:**

ئەگەر هات ئەجنەبی لوتفت لەگەڵ کات

بە پارە ئەتکڕێ عـەقلی هــەبـا بــەس (قانیع ١٣٥)

نە هشیار بووم بەڵێ ئەممــا فوجـائـەت

مە دی هــاتی کو ئــەو زاتێ موبــارەك (داهی ٦٠)

نەگــەیمــە ئــەو جوانــەو گەیمە پیری

مـەدەد یــا پــیری پــیرانی بــوخـــارا (مەحوی ٨)

پــەشێمــانم ژ وێ عومــری کو بووری

نزانم دێ چ کەم چەند رۆژ مــە مـــانــە (بریفکانی ٤٤)

تــەمــەننــایێ دکــم هندی ژ جــانـــان

قــەرارا ڤـێ دلێ غــەمگــین قــە نــابت (پەرتۆ ١٦٦)

## ٩- هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەقسوور:

**(٢٠÷٢=١٠=٣،٤،٣)**

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب مەقبووز مەقسوور

فاعیلُ مفاعلن مفاعیلْ

مفعولُ مفاعلن فعولان

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ئەخرەب مەقبووز مەقسوور

فاعیلُ مفاعلن مفاعیلْ

مفعولُ مفاعلن فعولان

| فعولان | مفاعلن | مفعولُ |
|---|---|---|
| . -- -- U | -- U -- U | U -- -- |
| ٣ | ٤ | ٣ |
| | ١٠ | |

| فعولان | مفاعلن | مفعولُ |
|---|---|---|
| . -- -- U | -- U -- U | U -- -- |
| ٣ | ٤ | ٣ |
| | ١٠ | |

هەمووی ٢٠ برگە

دوو عەرووزی هەیە:

١- مەقسوور (فعولان) وەکوو زەربەکەی

٢- مەحزووف (فعولن)

نموونە:

گەر گوڵ لە گوڵان ببن بە دڵدار

با خۆڵی وە سەر بی بولبولی ژار (خانی،١، ٣٢٣)

شیکردنەوە:

گە/ر گوڵ/ لە// گو/ڵان/ ببن// بە/ دڵ/دار

-- -- U // U – U --- // U -- -- .

مفعولُ // مفاعلن // فعولان

با /خۆ/ڵی// وە/ سەر /بی/ بول//بولی/ ژار

-- -- U // U – U --- // U -- -- -- .

مفعولُ // مفاعلن // فعولان

کێشی هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەقبووزی مەقسوور.

نموونەیەك بۆ عەرووزی مەحزووف:

دڵ بەحرە ئو سەد هەزا//ر مەوجن

مەحزووف فعولن

زاهید چ خەبەر ژ بەحری مەوواج

ئەم دێرە شیعرانەیش لە سەر هەمان قالبەکێشن، شییان بکەوە:

هیوامە لە راستو بێ گرێیان

نەبیەن لە چنۆكو زۆر بلێیان (خانی،٢، ٢٥٤)

١٦ بڕگـه (٤ + ٤+ ٤ +٤) ( مفـتعلن مفـاعلن مفـتعلن مفـاعلن)2X (رەجـەزی هەشتی مەتوی مەخبوون)

١٥ بڕگـه (٤+ ٤+ ٤ +٣) (فـاعلاتن فـاعلاتن فـاعلاتن فـاعلان)2X (رەمـەلی هەشتی مەقسوور)

١٥ بڕگـه (٤+ ٤+ ٤ +٣) (فـاعلاتن فـاعلاتن فـاعلاتن فـاعلن)2X ( رەمـەلی هەشتی مەحزووف)

١٥ بڕگه (٤+ ٤+ ٤ +٣) (فاعلاتن فعلاتن فعلاتـن فعـلان)2X (رەمـەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوور)

١٥ بڕگه (٤+ ٤+ ٤ +٣) (فاعلاتن فعلاتـن فعلاتـن فعلـن)2X (رەمـەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووف)

١٥ بڕگـه (٤+ ٤+ ٤ +٣) (مفـاعلن فعلاتـن مفـاعلن فعـلان)2X (موجتەسـی هەشتی مەخبوونی مەقسوور)

١٥ بڕگـه (٤+ ٤+ ٤ +٣) (مفـاعلن فعلاتــن مفـاعلن فعلــن)2X (موجتەسـی هەشتی مەخبوونی مەحزووف)

١٤ بڕگـه (٤+ ٤+ ٤ +٢) (مفـاعلن فعلاتـن مفـاعلن فـع لان)2X (موجتەسـی هەشتی ئەصلەم موسەببەغ)

١٤ بڕگـه (٤+ ٤+ ٤ +٢) (مفـاعلن فعلاتـن مفـاعلن فـع لـن)2X (موجتەسـی هەشتی ئەصلەم

١٤-برگـه (٣ + ٤+ ٤ + ٣) (مفعـول مفاعيـل مفاعيـل فعـولان)٢X (هـەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور)

١٤ برگە (٣ ٤ + ٤ + ٣) (مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن)٢X (هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف)

١٤ برگـه ( ٣+ ٤+ ٣ +٤) (مفعـول مفـاعيلن مفعـول مفـاعيلان)٢X (هـەزەجی هەشتی ئەخرەبی موسەببەغ)

١٤ برگـه (٣ + ٤+ ٣ +٤) (مفعـول مفـاعيلن مفعـول مفـاعيلن)٢X (هـەزەجی هەشتی ئەخرەب)

١٤ برگە (٤+ ٤+ ٤ +٢) (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)٢X ( رەمەلی هەشـتی مەخبوونی ئەصلەم موسەببەغ)

١٤ برگە (٤+ ٤+ ٤ +٢) (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فـع لـن)٢X (رەمـەلی هەشـتی مەخبوونی ئەصلەم)

١٤ برگە (٣ +٤ + ٣ +٤) (مفعول فاع لاتـن مفعـول فـاع لاتـان)٢X (مـوزاریعی هەشتی ئەخرەبی موسەببەغ)

١٤ برگـه ٣+ ٤+ ٣+٤) (مفعـول فـاع لاتـن مفعـول فـاع لاتـن)٢X (مـوزاریعی هەشتی ئەخرەب)

١٤ برگـه (٣+ ٤+ ٤ +٣) (مفعـول فـاع لات مفاعيـل فـاعلان)٢X(مـوزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور)

١٤ برگه (٣+ ٤ +٤ +٣) (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)٢X( موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف)

١٤برگـه (٤ + ٣ + ٤ + ٣) (مفـتعلن فـاعلن مفـتعلن فـاعلان) ٢X (بەسـیتی هەشتی مەتوی موززال)

١٤ برگـه (٤ + ٣ + ٤ + ٣) (مفـتعلن فـاعلن مفـتعلن فـاعلن) ٢X (بەسـیتی هەشتی مەتووی)

١٢- برگه (٣ + ٣ + ٣ + ٣) (فعولن فعـولن فعـولن فعـولن) ٢X (موتـەقارەبی هەشتی تەواو)

١١ برگـه (٤ + ٤ + ٣) (مفـاعیلن مفـاعیلن فعـولان)٢X (هـەزەجی شەشـی مەقسوور)

١١ برگـه (٤ + ٤ + ٣) (مفـاعیلن مفـاعیلن فعـولن)٢X (هەزەجـەی شەشـی مەحزووف)

١١ برگه (٤+ ٤ +٣) (فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)٢X (رەمەلی شەشی مەقسوور)

١١ برگه (٤+ ٤ +٣) (فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)٢X (رەمەلی شەشی مەحزووف)

١١ برگـه (٣ + ٣ + ٣ + ٢) (فعـولن فعـولن فعـولن فعـول) ٢X (موتـەقارەبی هەشتی مەقسوور)

١١ برگـه (٣ + ٣ + ٣ + ٢) (فعـولن فعـولن فعـولن فعـل) ٢X (موتـەقارەبی هەشتی مەحزووف)

١١برگه (٤+ ٤ + ٣) (مفتعلن مفـتعلن فـاعلان) ٢X (سـەریعی هەشـتی مـەتوی مەوقووف)

١١برگه (٤+ ٤ + ٣) (مفتعلن مفـتعلن فـاعلن) ٢X (سـەریعی هەشـتی مـەتوی مەکشووف)

١١ برگه (٤+ ٤+ ٣) (فاعلاتن مفاعلن فعلان)٢X ( خەفیفی شەشی مـەخبوونی مەقسوور)

١١ برگه (٤+ ٤+ ٣) (فاعلاتن مفاعلن فعلـن)٢X ( خـەفیفی شەشـی مـەخبونی مەحزووف)

١٠ برگه (٣ + ٤ + ٣) (مفعول مفاعلن فعولان)٢X (هەزەجی شەشی ئـەخرەبی مەقبووزی مەقسوور)

١٠ برگه (٣ + ٤ + ٣) (مفعول مفاعلن فعولن)٢X (هەزەجی شەشـی ئـەخرەبی مەقبووزی مەحزووف)

١٠ برگه (٤+ ٤+ ٢) (فاعلاتن مفاعلن فع لان)٢X ( خەفیفی شەشی مەخبوونی ئەصلەم موسەببەغ)

١٠ برگه (٤+ ٤+ ٢) (فاعلاتن مفاعلن فع لن)٢X ( خەفیفی شەشـی مـەخبوونی ئەصلەم).

## نموونەی گشتی

لە سەر هەموو قالبە (لقە) باوەکانی کێشی عەرووزیی لە کوردی:

رەببــی مــووی لێ بــێ زمــانی پەنجــەکانی هــەڵوەرێ

هــەر کەســێ گوڵــشەن بــە دەردی کوڵخــەنی دۆزەخ بــەرێ

( حەمدی ٨٦)

شەو دێ لە عومرم کەم دەبێ رۆژ دێ لە عومرم کـەم دەبـێ

ئەز خـۆفی وی ئافـەت دەبـێ جا چـۆن دڵـم پـڕ غـەم نـەبێ

(ئە. کۆر ٢٧٣)

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا لـە راسـتی مووچـەخۆری خـۆی

سـوراحی سـەرفرۆدێنێ لـە بـۆ پیاڵـە کـە تێکـا بـۆی

(پیرەمێرد ٧٢)

جودابــوون ژەڤ رح‌و قالــب د عــشقا بولبــول‌و گولــدا

د نـەزما نووبـەهار دیـسا تـەنێ عـشقا مـە غـەددار بـەس

(داهی ٤٨٩)

ســێ ســاڵە ژ دەردێ تــە غــەم‌و تــەعلی دبــارن

مــا هێــژ تــو نزانــی ژ برینــا دکــەلم ئــەز

(بریفکانی ٩٢)

بکێـــشه دەســـتی دل جـــارەك ب ســـەد نـــاز
ل ســـــحرێ وی هـــــەمی مـــــەككاری تـــــەنناز

(پەرتۆ ۲۲۲)

کـــە شـــادی دوژمـــنو غـــەم دۆســـتە یـــاران
جـــەفا یـــارو وەفـــا ئـــەغیارە بـــێ تـــۆ

(صافی ۱۹۲)

وەی کە رووزەردی مەدینەو رووسیاهی مەککە خۆم
دەرکراوو دەر بە دەر یا رەب دەخیلی عەفوی تۆم

(نالی ٦٥)

ئـــەی شـــوکری تـــە جەوهـــەرا زەبـــانی
وەی زیکـــری تـــە ســـەیقەلا جـــەنانی

( خانی، ۱، ٦)

کـەس نـەما مەهـدەر بکـت ئـیرۆ ل حـالێ تـە دەلیـل
مەلجـەئێ عیـشقو عوشـاقان ئـەو رەبـێ تم باقییـە

(داهی ۷٦)

بـۆ رەفـوو کردنـی چـاکی دەمـی شمـشێری بـرۆ
موژە تـەڕ دەستە لـە دڵما وەکـوو سـوژن لـە حـەریر

(سالم ٦٨)

بیـدی مەجنوونـە وجـوودم لـە هـەموو بـەر بەرییـە
نـە کەسـێ مونتـەفیعی یـەك بـەری یـا سـێبەرییە

(نالی ۱۱۲)

زالمـــــی دڵڕەقـــــی ڕوو گـــــرژی موســـــولمان ئـــــازار
هـــەر بـــە ئیزایـــە کـــە ڕەنگـــی بگەڕێتـــە ڕوخـــسار

(مەحوی٣٣٧)

چـــەند هـــەزارێکی ئـــەتۆ ســـاڵی لـــە برســـا دەمـــرێ
ســـەد ئەوەنـــدەش جگـــەری ڕێـــڕەوی گـــەرما دەبـــڕێ

(ئەسیری ٢٧٥)

بـــێ لـــەبت شـــاد نـــین بـــە سەرچـــەشمەی حـــەیات
دەردی تـــــۆ نـــــادەم بـــــە دەرمـــــانی حـــــەکیم

(سالم ٨٨)

ئـــــەو زەمـــــانی بوونـــــە ئـــــاردی نێـــــو دڕك
پارەیـــــەك ناكـــــا دو ســـــەد جـــــار بێتـــــە ڕك

(حاجی٢٠٧)

نـــــاری ســـــینەم گـــــەر نـــــەبێ غـــــەرقم ئـــــەمن
ئـــــاوی چـــــاوم گـــــەر نـــــەبێ ســـــووتاومەز

(نالی ٢٢٢)

ئـــەی قیبلـــەیی مـــورادان ئـــاخۆ بـــە ڕۆژگـــاران
پرســـیوتە قـــەت لـــە هـــیچ کـــەس حـــاڵی غـــەریبی تـــاران

(سالم ٨٩)

هوستایی عیشقێ دل فەهۆت سەر تا قـەدەم هنگـی دصۆت
ڕەمـزا ئەنەلحـەق هـەر دگـۆت بـاوەڕ بکـەن مەنـسوورە دل

(جزیری ٣٥٣)

دڵ پــەی دەکــا نیگــاهی ســەهمی مــوژەی ســیاهی
رەمــزی هــەموو بەڵایــە غــەمزی هــەموو موســیبە

(نالی ٣٩٧)

قوربــان مەحالــە پێکــەوە بــن ســەبرو ئیــشتیاق
خــاریج لــە نەســـی ئایەتــە تــەکلیفی لایوتــاق

(نالی ٣٤٨)

شــاخانی ئــەورووپا بــە فیــدای ئــەم مەقامــە بــن
هــەر مــەنزەرەی تەبیعییەکــەی مــەحوەکا کــەدەر

(زێوەر ١٦)

مــاوەر کــە تــەرح و پــشکووان جیرانــی بــەرگ و لوولــووان
ئەو عەرعەرو سەلوا جوان شــەتری ب مەستی لێ خوشــین

(جزیری ٣٩٠)

نەفحە بدا لە عەتری زولف لەو دەمــە بۆ دەمــاغی خوشــك
تەپڵە بە تەپڵە مشك بە مــشك نافــە بــە نافــە بــوو بــە بــوو

(سالم ١١٢)

ئــــەی خــــیرەد تــــو خــــووا لــــە دڵ دەرچــــۆ
دڵ نــــــەماوە لــــــە فیرقــــــەتی دڵــــــدار

(سالم ٥٩)

مــــــن کەســــــێکم زەمانــــــەیی ناکــــــەس
دابڕیــــــوم لــــــە قــــــەوم و قیلــــــەو کــــــەس

(حاجی ٢١٠)

لە وەختی عالەمی ئەرواحەوە هەتا ئێستا

سەفەر ئەکەم نەگەیشتم بە مەنزیلی دڵدار

(حەریق ٢٥)

نەزەر لە گۆشەیی چاوی لە خاکی تیرە بکا

بە نووری تەربیە ئەیکا بە کیمیا دەرویش

(خادیم،١، ١٤٨)

لە سەر دەشتی میحنەت پەڕەی کردەوە

کەوانی بەلالووکەیی پەیکەرم

(حاجی ٢٦٦)

بێژەنی چاهی زەقەنی تۆیە دڵ

راهی نەجاتی فەلەکو رێسمان

(حاجی ٩٤)

# چەند سەرنجێکی گشتی

* ئەم کێشانەی لێرەدا باس کراون بە گوێرەی زنجیرەی ناو بازنەکانەوە نەهاتوون. بە پێی زۆر بە کار هاتنیان لە کوردیدا، ریز کراون.

* کێشەکانی تر بۆیە باس نەکراون چونکە یان لە کوردیدا نین یان هەن‌و بە کەمی‌و دەگمەنی بە کار هاتوون.

* کێشی هەزەج‌و کێشی رەمەل بە رادەیەکی گەلێ زۆر لە شیعری کوردیدا بە کار هاتوون. هەموو شاعیرانی کلاسیکی کوردی ئەم دوو کێشەیان بە کار هێناوە کە لە هەموو کێشەکان باوترن‌و بە هەردووکیان نزیکەی (٨٧٪)ی شیعری کوردیان پێ نووسراوە.

* ئەم کێشانەی لیرەدا باس کراون هەموو لقەکانیان باس نەکراوە. تەنیا لقە باوەکانیان باس کراوە.

* بۆ هەر قالبە کێشێك (٥) نموونەو بۆ هەر کێشێك (١٥) نموونەو بۆ هەموو کێشەکان (٣٠) نموونە بۆ مەشق‌و راهێنانان دراوە.

* لە هەموو لقە کێشە مەخبوونەکاندا، بە تایبەتی لە لقە مەخبوونەکانی رەمەل‌و موجتەس‌و خەفیفدا، وا دەبێ لەتێکیان برگەیەك کەمتر بێ لە لەتەکەی تر. بەم جۆرە:

جیاوازییەکە هەمیشە لە (فاعلاتن)ی کۆتایی لەتەکاندا دەردەکەوێ. واتە لە عەرووزو زەربدا. ئەگەر عەرووز ئەصلەم (فع لن) یان ئەصلەم موسەببەغ (فع لان) بێ‌و لە هەمان دێردا زەرب مەخبوونی مەحزووف (فعلن) یان مەخبوونی مەقسوور (فعلان) بێ، سەدر برگەیەکی کەمتر دەبێ لە عەجز. ئەگەر عەرووز مەخبوونی مەحزووف (فعلن) یان مەخبوونی مەقسوور (فعلان) بێ‌و لە هەمان دێردا زەرب ئەصلەم (فع لن) یان ئەصلەم موسەببەغ (فع لان) بێ سەدر برگەیەك زیاتر دەبێ

لە عەجز.(بۆ زانیاری زیاتر لەم دیاردەیەوە بڕوانە: (عەزیز گەردی، نایەكسانی بڕگەیی لە سەدرو عەجزی هەندێ كێشی عەرووزیدا، گۆڤاری زانكۆی سەلاحەدین، ژمارە ( ١٣)ن ٢٠٠١)

* لە زۆر بە كارهێنانی چوار قالب (لق)ە كێشدا، هەزەج و رەمەل پێچەوانەی یەكترن. هەزەجی هەشتی موسەببەغو هەزەجی هەشتی تەواو لە كوردیدا زۆر بە كار هاتوونو هەزەجی هەشتی مەقسووررو هەزەجی هەشتی مەحزووف كەم بە كار هاتوون. كەچی رەمەلی هەشتی مەقسووررو رەمەلی هەشتی مەحزووف زۆر بە كارهاتوونو رەمەلی هەشتی مومەسەببەغو رەمەلی هەشتی تەواو كەم بە كار هاتوون.

* لە مەسنەویاتدا، كە سەرواكانی دوو لەت دوو لەت بە یەكەوە دێن، عەرووزو زەربی موسەببەغو تەواو، موزالو تەواو، مەقسووررو مەحزووف، مەقتووعو مەحزووف لە یەك هۆنراوەدا بە كار دێن. بۆ نموونە وەكوو مەمو زینی خانیو وەرگێڕانەكەی هەژار، كێشەكەی لە نێوان هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەقسووررو هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووفدایە.

* كێشی رەجەز لە شیعری زاری كرمانجی باكوور زیاتر بە كار هاتووە بە بەراورد لەگەڵ شیعری زاری كرمانجی ناوەڕاست.

* جێی سەرنجە كێشی موجتەس، كە تا رادەییەكی باش لە شیعری زاری ناوەڕاستی كوردیدا هاتووە، لە شیعری زاری باكووردا نەكەوتۆتە بەر چاو.

# بەشی سێیەم

# کێشی ژمارەیی لە شیعری کوردیدا

لە کێشی ژمارەییدا حیساب تەنیا بۆ ژمارەی برگەکانی دێرە شیعرو دابەشبوونیان بە سەر پێدا دەکرێ. گوێ بە جۆری برگە (کورتیو درێژی)و چۆنیەتی ریزبوونیان نادا. ئەمە کێشی رەسەنی کوردییە. هەموو شیعری میللی کوردی بەم جۆرە کێشە گوتراوە. هەروەها نزیکەی هەموو شیعری زاری گۆران بەم جۆرە کێشە نووسراوە. جگە لە زۆربەی هەرە زۆری چیرۆکە شیعرییە باوەکانی کوردەواریو چیرۆکە ئایینییەکان.

لە کێشی ژمارەییدا ، حیساب تەنیا بۆ لەتێك دەکرێ. چەند پێیەو پێیەکان چەند برگەیین کەچی لە کێشی عەرووزیدا ، وەکوو دیمان حیساب بۆ هەردوو لەت دەکرێ. پێی کێشی ژمارەیی بە ژمارەی برگە دیارە دەکرێ نەك وەکوو پێی عەرووزی کە بە کێشی تایبەتی دیاری دەکرێو پێیەکانی لە (فعل)ی عەرەبی وەردەگیرێ. پێیەکانی کێشی ژمارەیی کوردی ژمارەیان کەمە. تەنیا سێ پێی سەرەکی هەن. ئەم جۆرە کێشە هەندێ کەس پێی دەڵێن (کێشی برگەیی)و هەندێکی تر پێی دەڵێن (کێشی خۆماڵی).

لەوانەی باسی ئەو جۆرە کێشەیان کردووە، وتارەکەی جگەر خوێن لە هەموویان سەرنجکێشترە (گۆڤاری هاوار ژمارە ٢٢ سالی ٢ ، ١٩٣٣). جگەر خوێن هەوڵی داوە هەندێ زاراوەی تایبەتی دابنێ. ئەو بۆ لەتە شیعر زاراوەی (گاڤ)و بۆ برگە (موڤك)ی داناوەو هەوڵی داوە ناوی تایبەتی بۆ کێشەکان دابنێو ناوەکانی لە جۆری ئەسپەوە وەرگرتەوە. وەکوو:

ئەسپی چەلەنگ دوو لەتی پێنجییە، ئەسپی لاغر دوو لەتی شەشییە (ئەمە لە راستیدا دوو پێی سێییە)، ئەسپی سڤك دوو لەتی حەفت برگەییە ( لە راستیدا

دوو پێیە: چواریو سێیی)، ئەسپی ڕەوان دوو لەتی هەشت بڕگەییە ( لە ڕاستیدا دوو پێی چوارییە) چونکە لە کێشی ژمارەییدا حیساب تەنیا بۆ ژمارەی بڕگەکانی لەتێك دەکرێ نەك هەردوو لەت.

پێیە سەرەکییەکانی کێشی ژمارەیی کوردی:

١- پێی سێ بڕگەیی

٢- پێی چوار بڕگەیی

٣- پێی پێنج بڕگەیی

پێیە ناسەرەکییەکانی کێشی ژمارەیی کوردی:

تەنیا دوو پێی ناسەرەکی هەن:

١- پێی یەك بڕگەیی

٢- پێی دوو بڕگەیی.

ئەم دوو پێیە ناسەرەکییە تەنیا لە شیعری ئازاددا دەردەکەونو زۆر بە کەمیش. بە تایبەتی پێی یەك بڕگەیی هەر زۆر بە دەگمەن دەردەکەوێ.

چەند پێیەك لە سێ پێیە سەرەکییان خۆیان دەدەنە پاڵ یەکترو لەتە دێر پێك دێنن.

ئەمەیش گرنگترین کێشی ژمارەیی شیعری کوردیو ژمارەی پێو بڕگەکانیان.

کێشی ژمارەیی کوردی بە پێی جۆری پێیەکانی لەتە شیعر سێ جۆرە:

١- کێشی ساف

٢- کێشی تێکەڵاو

٣- کێشی دەوری

## یەکەم: کێشی ساف:

کێشی ساف لە دووبارەبوونەوەی یەك جۆرە پێ دروست دەبێ:

### ١- پێی سێ بڕگەیی:

ئەم پێیە چەند جارێك لە لەتە دێرێك دووبارە دەبێتەوەو بە گوێرەی ژمارەی پێیەکانی لەتە دێرەکە کێشی جیا جیا دروست دەکا. بەم جۆرە:

#### ئەلف- دوو پێی سێ بڕگەیی:

نموونە:

هاڤینا دلێ من    ئاڤا سار دخوازە (ك. بەدرخان ل٣٧)

شیکردنەوە:

ها/ڤی/نا//د/ل/ێ من

١ /٢/ ٣ //١ /٢/ ٣

ئا/ڤا/ سار// د/خوا/زە

١ /٢/ ٣ // ١ /٢/ ٣

ئەم دێرە شیعرە هەر لەتێکی دوو پێی سێ بڕگەییە، واتە ژمارەی بڕگەکانی ٦ بڕگەیە:

٦ = ٣ + ٣

ب- سێ پێی سێ بڕگەیی:

نموونە:

ئەسووتاو شەوقێکی زەردباوی

ئەدا لە روخســـاری غەمگینی (شێرکۆ)

شیکردنەوە:

ئە/سوو/تاو// شەو/قێ/کی// زەرد/با/وی

١ / ٢ / ٣ // ١ /٢/ ٣ // ١/ ٢ /٣

ئە/دا /لە// روخ/سا/ری// غەم/گی/نی

١ / ٢/ ٣ // ١ /٢/ ٣ // ١/ ٢ /٣

ئەم دێرە شیعرە هەر لەتێکی سێ پێی سێ بڕگەییە، واتە ژمارەی بڕگەکانی ٩ بڕگەیە.

٩ = ٣ + ٣ + ٣

ج- چوار پێی سێ بڕگەیی:

نموونە:

قژ کـــالی لێو ئاڵی پرشنگی نیگـــا کـــال

ئەی کچە جوانەکەی سەر گۆنا نەختێ ئاڵ (گۆران)

شیکردنەوە:

قژ/ کا/لی// لێو/ ئا/ڵی// پر/شن/گی// نی/گا /کال

١ / ٢ / ٣ // ١ /٢/ ٣ // ١ /٢/ ٣ // ١ / ٢ / ٣

ئەی/ ك/چە// جوا/نە/کەی// سەر/ گۆ/نا// نەخ/تیَ/ ئاڵ

١ / ٢ / ٣ // ١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢ / ٣

هەر لەتێکی چوار پێی سێ بڕگەییە، واتە ژمارەی بڕگەکانی ١٢ بڕگەیە

١٢ = ٣ + ٣ + ٣ + ٣

پوختەی کێشە سافەکانی پێی سێ بڕگەیی:

١- دوو پێیی (٦ = ٣ + ٣)

٢ - سێ پێیی (٩ = ٣ + ٣+ ٣)

٣ - چوار پێیی (١٢ = ٣ + ٣+ ٣ + ٣)

<u>٢- پێی چوار بڕگەیی:</u>

ئەم پێیە چەند جارێك لە لەتە دێرێك دووبارە دەبێتەوەو بە گوێرەی ژمارەی پێیەکانی لەتە دێرەکە کێشی جیا جیا دروست دەکا. بەم جۆرە:

<u>ئەلف- یەك پێی چوار بڕگەیی:</u>

نموونە:

دارو چیا نەما گیا (ك. یەدرخان)

شیکردنەوە:

دا/رو/ چ/یا

١ / ٢ / ٣ /٤

نە/ما/ گ/یا

١ / ٢ / ٣ / ٤

هەر لەتێکی یەك پێی چوار بڕگەییە، واتە ژمارەی بڕگەکانی ٤ بڕگەیە.

٤ = ٤

ب- دوو پێی چوار بڕگەیی:

نموونە:

لە ژێــرزەردەی خۆرەتـــاوا

بە ناو چیمەنی گوێ ئاوا (گۆران)

شیکردنەوە:

لە/ ژێر/زە ر/دەی// خۆ/رە/ت/اوا

١/ ٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢ ٣/ / ٤

بە/ ناو/ چی/مە//نی/ گوێ/ ئا/وا

١/ ٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢ ٣/ / ٤

هەر لەتێکی دوو پێی چوار بڕگەییە، واتە ژمارەی بڕگەکانی ٨ بڕگەیە.

٨ = ٤ + ٤

ج- سێ پێی چوار بڕگەیی:

نموونە:

بڵێن بە یار بڵێن بە یــار یــاری نـــازدار

سەد هەزار جار خۆزگەم بە یار منی هەژار (گۆران)

شیکردنەوە:

ب/لێن/ بە/ یار // ب/لێن/ بە/ یار// یا/ری/ ناز/دار

١ /٢/ ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣ / ٤ // ١ /٢/ /٣/ ٤

سەد/ هە/زار/ جار// خۆز/گەم/ بە/ پار// م/نی// هەژار

١ /٢/ ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣/ ٤ // ١ /٢/ /٣/ ٤

هەر لەتێکی سێ پێی چوار بڕگەییە، واتە ژمارەی بڕگەکانی ١٢ بڕگەیە.

١٢ = ٤ + ٤ + ٤

د- چوار پێی چوار بڕگەیی:

نموونە:

ڕێگـــەم بـدە دایبهێنم چەپکـــە خـــەمی پەرچەمی تۆ

دەروونی من پڕ لە عیشقە خۆم ئەکەم بە هاوخەمی تۆ (ح. قەرەداغی)

شیکردنەوە:

ڕێ/گەم/ ب،دە// دای/ب/هێ/نم// چەپ/کە/ خە/می// پە/ر/چە/می/ تۆ

١ /٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢/ ٣/ ٤

دە/روو/نی/ من// پڕ/ لە/ عیش/قە// خۆم/ ئە/کەم/بە// هاو/خە/می/ تۆ

١ /٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢/ ٣/ ٤ // ١ /٢/ ٣/ ٤

هەر لەتێکی چوار پێی چوار بڕگەییە. واتە ژمارەی بڕگەکانی ١٦ بڕگەیە.

١٦ = ٤ + ٤ + ٤+ ٤+

<u>پوختەی کێشە سافەکانی پێی چوار بڕگەیی:</u>

١- یەك پێیی (٤ = ٤)

٢- دوو پێیی (٨ = ٤ + ٤)

٣- سێ پێیی (١٢ = ٤ + ٤ + ٤)

٤- چوار پێیی (١٦ = ٤ +٤ + ٤ + ٤+)

٣- <u>پێی پێنج بڕگەیی:</u>

ئەم پێیە چەند جارێك لە لەتە دێرێك دووبارە دەبێتەوەو بە گوێرەی ژمارەی پێیەکانی لەتە دێرەکە کێشی جیا جیا دروست دەکا. بەم جۆرە:

<u>ئەلف – یەك پێی پێنج بڕگەیی:</u>

نموونە:

من بازاڕ ناڤێ بەس لێڤا ئاڤێ (ك. بەدرخان)

شیکردنەوە:

من/ با/زاڕ/ نا/ڤێ / بەس/ لێ/ڤا/ئا/ڤێ

١ /٢/ ٣ / ٤ ٥ / ١ /٢/ ٣ / ٤ / ٥

هەر لەتێکی یەك پێی پێنج بڕگەییە. واتە ژمارەی بڕگەکانی پێنج بڕگەیە.

٥ = ٥

ب- دوو پێی پێنج بڕگەیی:

نموونە:

گـــول چون رووی نەزاکـــەت پۆشـــــان

وەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان (مەولەوی)

شیکردنەوە:

گوڵ/ چون/ رووی/ ئا/زیز// نە/زا/کەت/ پۆشان

١ / ٢ / ٣ / ٤ /٥ // ١ / ٢ / ٣ / ٤ /٥

وەف/را/وان/چون/ سەیل//دی/دەی/ من/جۆشان

١ / ٢ / ٣ / ٤ /٥ // ١ / ٢ / ٣ / ٤ /٥

هەر لەتێکی دوو پێی پێنج بڕگەییە. واتە ژمارەی بڕگەکانی ١٠ بڕگەیە.

١٠ = ٥ + ٥

ئەم کێشە لە هەموو کێشە ژمارەییەکانی کوردی باوترەو لە هـەموو یـان زیـاتر لە شـیعری سـتوونی بـە کـار هـاتووە. نزیکـەی هـەر هـەموو شـیعری زاری گۆران‌و زۆربەی هەرە زۆری چیرۆکە شـیعرییەکان‌و شـیعری میللـی بـەم کێـشە نووسـراون بۆیە ئەم کێشە بە (کێشی نەتەوایەتی کوردی) دادەنرێ.

ج- سێ پێی پێنج بڕگەیی:

نموونە:

تورقـــاڵێ زێڕی زەردو ســـاردو ســڕ خودا پێی داوە

لەم ناو باخەدا چیمەنی سینەی بۆ رێك خراوە (ح. قەرەداغی)

شیکردنەوە:

توز/قا/ڵێ/ زێ/ڕی// زەر/دو/ سار/دو/ سڕ// خو/دا پێی/ دا/وە

١/ ٢/ ٣/ ٤/ ٥ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ ٥ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ ٥

لەم/ ناو/ با/خە/دا// چی/مە/نی/ سی/نەی// بۆ/ ڕێك/ خ/را/وە

١/ ٢/ ٣/ ٤/ ٥ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ ٥ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ ٥

هەر لەتێکی ئەم دێرە شیعرە سێ پێی پێنج بڕگەییە. واتە ژمارەی بڕگەکانی ١٥ بڕگەیە.

١٥ = (٥ + ٥ + ٥)

پوختەی کێشە سافەکانی پێی پێنج بڕگەیی:

١- یەك پێی (٥ = ٥)

٢- دوو پێیی (١٠ = ٥ + ٥)

٣- سێ پێیی (١٥ = ٥ + ٥ + ٥)

## دووەم: کێشی تێکەڵاو

کێشی تێکلاو لە دوو پێ دروست دەبێ هەر یەکە جۆرە پێیەکە. یان لە سێ چوار پێ دروست دەبێ پێیەکیان یەك جار دێو پێیەکانی تر دوو سێ جار دێن.

ئەلف– پێیەکی چوار برگەییو پێیەکی سێ برگەیی:

نمونە:

جەژنی دارو درەختە

کۆتایی رۆژی سەختە (هەوری)

شیکردنەوە:

جەژ/نی/ دا/رو// د/رەخ/تە

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣

کۆ/تا/یی/ رۆ// ژی/ سەخ/تە

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣

هەر لەتێکی ئەم دێرە لە دوو پێ پێك هاتووە. پێیەکی چواریو پێیەکی سێیی. واتە ژمارەی برگەکان ٧ برگەیە.

٧ = ٤ + ٣

<u>ب – دوو پێی چوار بڕگەیی‌و پێیەکی سێ بڕگەیی:</u>

نموونە:

ئەی شەوەکەی بێ ترووسکەی دڵتەنگی

کوا تریفەی زەردەخـەنەی هـاودەنگی   (جەمال شاربازێڕی)

شیکردنەوە:

ئەی/ شە/وە/کەی// بێ/ ت/رووس/کەی// دڵ/تە‌ن/گی

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣

کوا/ت/ری/فەی// زەر/دە/خە/نەی// هاو/دەن/گی

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣

هەر لەتێکی ئەم دێرە لە سێ پێ پێك هـاتووە. دوو پێـی چـواری‌و پێیـەکی سێیی. واتە ژمارەی بڕگەکان ١١ بڕگەیە.

١١ = ٤ + ٤ + ٣

ج– سێ پێی چوار بڕگەیی‌و پێیەکی سێ بڕگەیی:

نموونە:

هـەوری ڕێگر لە هەتـاوی خۆری نـەورۆزی هیوا

وەکوو خەفەت جەرگ‌و دڵی ساماڵی ئاسمان ئەخوا (شێرکۆ)

شیکردنەوە:

هەو/ری/ڕێ/گر// لە/ هە/تا/وی// خۆ/ری/ نەو/ڕۆ//زی/ هی/وا

١ / ٢ / ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣

وە/کوو/ خە/فەت// جەر/گو/ د/ڵی// سا/ما/ڵی/ ئاس//مان/ ئەخ/وا

١ / ٢ / ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣ / ٤ // ١ / ٢ / ٣

هەر لەتێکی ئەم دێرە شیعرە سێ پێی چواری‌و پێیکی سێیە. دە دەکاتە ١٥ بڕگە.

(١٥ = ٤ + ٤ + ٤ + ٣).

ج – دوو پێی چوار بڕگەیی‌و پێیەکی پێنج بڕگەیی:

نموونە:

ئەی شەوەزەنگ ئەی تاریکی ئەی ڕەشایی شەو

دەی باڵی ڕەش بکەرەوە بۆ چاوی بێ خەو (دیلان)

شیکردنەوە:

ئەی/ شە/وە/زەنگ// ئەی/ تا/ری/کی// ئەی/ ڕە/شا/یی/ شەو

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ ٤ ٥

دەی/ باڵ/ی ڕەش// ب/کە/ڕە/وە// بۆ/ چا/وی/ بێ/ خەو

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ ٤ ٥

هەر لەتێکی ئەم دێرە شیعرە لە سێ پێ پێك هاتووە. دوو پێی چوار بڕگەیی‌و پێیەکی پێنج بڕگەیی. واتە ژمارەی بڕگەکانی ١٣ بڕگەیە.

١٣ = ٤ + ٤ +٥ .

پوختەی کێشە تێکەڵاوەکان:

١- پێیەکی چوار بڕگەیی‌و پێیەکی سێ بڕگەیی : (٧ = ٤ +٣)

٢- دوو پێی چواری‌و پێیەکی سێیی: (١١ = ٤+ ٤ + ٣)

٣- سێ پێی چواری‌و پێیەکی سێیی: (١٥ = ٤ + ٤ + ٤ +٣)

٤- دوو پێی چواری‌و پێیەکی پێنجی: (١٣ = ٤ + ٤ + ٥)

## سێیەم: کێشی دەوری:

ئەو کێشەیە کە دوو پێی جیاواز بە نۆرە یەك لە دوای یەك دووبارە دەبنەوە.

- پێی چواری‌و پێی سێیی :

نموونە:

خەبەر بەرن بۆ شێخم تۆبەکەیم کوشتووە

پەشێمانم پەشێمان هـــەر مەیەکم رشتووە (ح. قەرەداغی)

شیکردنەوە:

خە/بەر/ بە/رن// بۆ/ شێ/خم// تۆ/بە/کە/یم// کوش/تو/وە

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ // ١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣

پە/شێ/ما/نم// پە/شێ مان// هەر/ مە/یە/کم// رش/تو/وە

١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣ // ١ ٢ ٣ ٤ // ١ ٢ ٣

ئەم دێرە هەر لەتێکی چوار پێیە. دوو پێی چواری‌و دوو پێی سێیی کە بە نۆرە دووبارە بوونەتەوە. چواری + سێیی + چواری + سێیی. کە هەمووی دەکاتە ١٤ برگە.

١٤ = ٤ +٣ + ٤+ ٣.

<u>پوختەی کێشی دەوری:</u>

- دوو پێی چواریو دوو پێی سێیی بە نۆرە (١٤ = ٤ + ٣ + ٤ + ٣)

<u>پوختەی هەموو کێشە ژمارەییەکانی شیعری کوردی کە لێرەدا باس کراون:</u>

١ - چوار برگەیی (٤ = ٤)

٢ - پێنج برگەیی (٥ = ٥)

٣ - شەش برگەیی (٦ = ٣ + ٣)

٤ - حەفت برگەیی (٧ = ٤ + ٣)

٥ - هەشت برگەیی (٨= ٤ + ٤)

٦ - نۆ برگەیی ( ٩ = ٣ + ٣ + ٣)

٧ - دە برگەیی (١٠ = ٥ + ٥ )

٨ - یازدە برگەیی (١١ = ٤ +٤ + ٣)

٩ - دوازدە برگەیی (١٢ = ٤ + ٤ + ٤)

یان (١٢ = ٣ + ٣ + ٣ +٣)

١٠ - سێزدە برگەیی (١٣ = ٤ + ٤ + ٥)

١١ - چواردە برگەیی (١٤ = ٤ + ٣ + ٤ + ٣)

١٢ - پازدە برگەیی (١٥ = ٥ + ٥ + ٥)

یان (١٥ = ٤ + ٤ + ٤ + ٣)

١٣ - شازدە برگەیی (١٦ = ٤ + ٤ + ٤ + ٤)

نموونەی گشتی بۆ کێشی ژمارەیی ستوونی کوردی:

تێخـــوڕە تێخـــوڕە

مـی تێـرو گـوان پـڕە

(گۆران)

گـــــولان ئـــــادار

بـــــێ ئـــــاڤو دار

( ک. بەدرخان)

لـــە بـــەر ئـــەوەی دڵ پەرۆشـــی رووی ئاڵـــە

دەروون ســـەودای لوتکـــەی بـــەرزو خاڵخاڵـــە

(گۆران)

بـــە ئاسمانـــــەوە ئەســـــتێرەم دیـــــوە

لـــــە باخـــــچەی بـــــەهار گـــــوڵم چـــــنیوە

(گۆران)

ئـــــەز کـــــــوردەکی بـــــــچووکم

وەلاتـــــــــێ مـــــــن مەزنـــــــــە

(ک. بەدرخان)

کەزیلەت ماریێ ئاویێ جیگرەی دەخـوا لـە گۆمـان

سـەبارەت بـە چـاوی تـۆ کەتمـە بـن بـاری لۆمـان

(فۆلکلۆر)

دەشـــــتی قـــــەراجی بـــــەر لـــــە کەندێـــــدا

ســـــندووقەی گرانـــــە چـــــەکی زێـــــڕ تێـــــدا

چـــەک بـــە مـــیرات بـــی یـــار لـــە بەندێـــدا

(فۆلکلۆر)

چـــەند ئەســـتێرەی لـــە ئاسمـــانێ
هەنـــــدەم خەنجـــــەر دادەڕژانـــــێ
یـــار لـــــەوێ بـــوو نـــــەموێرانێ

( فۆلکلۆر)

بڕوانـــە شـــاییە چـــۆپییە لـــەو ماڵـــە
گـوێ بگـرە زوڕنایـە دەهۆڵـە شمـشاڵە

(گۆران)

ئـــــــــــەم کوردســـــــــــتانە
گـــــــــــشتی جوانـــــــــــــە

(هـ. خۆرانی)

ئیمـشەو هـەر خەمـەن هـا نـە کـەمین دا
هـــەر دەردەن مـــدۆم وە ڕووی زەمینـــدا

(مەولەوی)

دونیـــــا هـــــەمووی چـــــاوڕ راوە
فـــــڕو فێـــــڵو بەنـــــدو بـــــاوە

(سەلام)

لـــــە لای عالـــــەم نیـــــوەڕۆ
هێـــشتا شـــەوە لـــە لای تـــۆ

(دڵدار)

ئـــــەڵێن ئـــــەمڕۆ بـــــەهارە
ولات بـــــــووکی نـــــــازدارە

( ب. زێوەر)

شـــــەو زرنگـــــاوە راشـــــکا
شـــەیتان ســـامی لـــە خـــوا شـــکا

(هێمن)

لــەو دەمەیــدا گــەڕی ڕەشــبەڵەك گەرمــە

لــەو دەمەیــدا دەکوشــن کــام پەنجــە نەرمــە

( هێمن)

بـۆ یـەك شـەو لای دایـە ئـەم دێیـە ڕێـی وێڵـم

بــەیانی ڕۆژهــەڵهات ســوار ئــەبم جێــی دێلــم

(گۆران)

تــا دەممــان لــە گــۆ ئەکــەوێ وەك تــۆ

هیـــــوای دایــــــە ڕۆ هیـــــوای بابـــــە ڕۆ

(گۆران)

لێــــــو بـــــــەرە بـــــۆ شمـــــــشاڵ

بـــــــە ســـــــــــۆزو ناڵـــــــــــەناڵ

(گۆران)

خـــــــــــەبات دەرمـــــــــــــان ددە

ژ بـــــــــــــۆ دەردو بـــــــــــــرین

(ك. بەدرخان)

چاوی زستان بـێ وەنـەوزە پێلـووی ئـارامی لێنـانێ

شەستە باران هـەزار بـە مـار نـادا بـە کـوڵی گریـانی

(شێرکۆ)

شـــــەماڵ هــــات بــــە گــــاڵ گـــاڵ

هــــــەور بــــوون گــــــەواڵ گــــــەواڵ

(هێمن)

ئــەڤ چــەند ســالن دلێ مــن قــەت نەگەشــە

دنـــــێ تــــاری دنـــــێ ئێڤــــارو رەشــــە

(ك. بەدرخان)

تا کەی بادەی خەم نۆش کردن بۆ بێزاری کرنۆش بردن

# بەشی چوارەم
# کێشی شیعری ئازاد

شیعری ئازاد لە هەموو دەستورێکی کێشی ستوونی ئازاد نییە. ئاشکرایە دیارترین خەسیەتی کێشی شیعری ستوونی کێش‌و سەروایە. شیعری ئازاد لەم دوو خەسیەتەدا تەواو خۆی بە دەستووری شیعری ستوونی نابەستێتەوە. هەمان پێی شیعری ستوونی بە کاردێنێ بەڵام خۆی بە ژمارەی پێیەکانی دێرە شیعرەکە نابەستێتەوە. پێیەك وەردەگرێ و لە هەر دێرێکدا (دێر لە کێشی ئازاددا وەکوو کێشی ژمارەیی یەك ریزە) ئەوەندە جارەی خۆی بیەوێ‌و ئاوازی شیعرەکە پێویست بکا دووبارەی دەکاتەوە.

بەش بە حاڵی سەروایش پەیڕەوی دابەشبوونی وردی سەروای کلاسیکی ناکا وەکوو یەکێتی سەرواو مەسنەوی‌و سێینەو چوارینەو پێنجینەو... هتد. بەڵکو کەی بە پێویستی زانی بە کاری دێنێ.

ئەم شیعری ئازادە لە هەموو شیعری جیهانیدا دیاردەیەکی تازەیە. شیعری ئازادی کوردی هەردوو جۆرە کێشی چەندی‌و ژمارەیی تێدا بە کار هاتووە بەڵام کێشی چەندی بە کەمی‌و کێشی ژمارەیی بە زۆری.

وەکوو زانراوە شیعری نوێ (ئازاد)ی کوردی لە بیست‌و سییەکانی سەدەی بیستەم لە سەردەستی گۆران‌و شێخ نووری شێخ سالح‌و نەجیب رەشیدو.. لە ژێر کاریگەری شاعیرە نوێخوازەکانی تورکی وەکوو تۆفیق فکرەت‌و جەلال ساهیروعەبدولحەق حامید هاتۆتە کایەوە.

## یەکەم: کێشی شیعری ئازادی عەرووزی ( چەندی ):

لەم جۆرە کێشەدا شاعیر تەفعیلەیەکی عەرووزی وەردەگرێ‌و لە هەر دێڕێکدا بە کەیفی خۆی چەند جاری بویێ ئەوەندە دووبارەی دەکاتەوە. بۆ نموونە سوارەی ئیلخانی زادە لە شیعری (خەوە بەردینەدا) کێشی موتەقارەبی بە کار هێناوە. واتە تەفعیلەی (فعولن)ی وەرگرتووەو لە هەر دێڕێکدا چەند جاری ویستبێ ئەوەندی دووبارە کردۆتەوە. خۆی بە ژمارەی تەفعیلەکانی کێشی موتەقارەب نەبەستۆتەوە لە دێڕێدا (٤ +٤ ). لە سەراپای شیعرەکەدا لە نێوان یەك تەفعیلەو شەش تەفعیلەی لە دێڕێك بە کار هێناوە:

وەهایە (فعولن) ١X

کە کانی بە هیوا لە سەر سەر(فعولن) ٣X

بەهارانە لووزەو ئەبەستن بەرەو شاری دەریا (فعولن) ٦X

بەڵام داخی جەرگم لەگەڵ هەر بەهارێ (فعولن) ٤X

کە رائەچڵەکن سەوزەڵانی (فعولن) ٣X

لە دوو دێری تردا دەڵێ:

کەچی وا کەوی‌و دەستەمۆی دەستەڵاتی رکەی دۆڵ‌و شیون (فعولن) ٦X

لە سەرسامی رێدا بەزیوو تەزیون. (فعولن) ٤X

دیارە لە دێری یەکەم یەك جارو لە دێری دووەم سێ جارو لە دێری چوارەم شەشەم جارو لە دێری پێنجەم چوار جارو لە دێری شەشەم سێ جار پێی (فعولن)ی هێناوە.

نموونەیەکی تر لە کێشی ئازادی چەندی (عەرووزی):

بە لاوی زێی ژیانم کردە رێ لێم دا مفاعیلن ٣X

لە لافاوی مفاعیلن ١X

ژیانیش هەر بەرەو هیوایە هەنگاوی مفاعیلن ٣X

ئەگەرچی دێوی مردن دایکوتاوە مێخ سکەی ئەنجام مفاعیلن ٤X

لە رووی ترس‌و ستەم وەستام. ( بیمار) مفاعیلن ٢X

وەکوو دیارە ئەم هۆنراوەیە لە سەر کێشی هەزەج (مفاعیلن) نووسراوە بەڵام شاعیر خۆی بە ژمارەی پێیەکانی هەزەج لە هەر دیرێدا نەبەستۆتەوە کە (٣ +٣)یە بەڵکو لە هەر دیرێدا چەند جاری ویستبێ بە ئازادی، ئەوەندە جارە دووبارەی کردۆتەوە. لە دێری یەکەم سێ جارو لە دێری دووەم دوو جارو لە دێری سێیەم سێ جارو لە دێری چوارەم چوار جارو لە دێری پێنجەم دوو جار پێی (مفاعیلن)ی هێناوە.

## دووەم: کێشی شیعری ئازادی ژمارەیی:

لەم جۆرە کێشەیشدا، شاعیر لە سێ پێیە سەرەکییەکەی کێشی ژمارەیی، پێیەکیان وەردەگرێو بە کەیفی خۆی چەند جار بیەوێ لە دێرێکدا دووبارەی دەکاتەوە. لە بەر ئەوەی سێ پێی سەرەکی لە کێشی ژمارەیی کوردی هەیە، ئێمە سێ جۆرە کێشی ئازادمان هەیە:

### ١- کێشی ئازادی پێی سێ برگەیی:

لەم جۆرە کێشەدا شاعیر یەك پێی سێ برگەیی وەردەگرێو دەیکا بە بنەمای کێشەکە. لە هەر دێرێکدا یەك پێ، یان چەند پێی سێ برگەیی دینێ. بۆ نموونە:

شێرکۆ لە شیعری (جارێکی تر سمکۆ ناچێتەوە سەر خوانی مردن)دا دەڵێ:

بە هۆرەی تفەنگی کاروانی بن بنار (٤ پێ = ١٢ برگە)

ئەستێرەی پشکۆیان (٢ پێ = ٦ برگە)

رژانە ناو چاوی بەیانی بەفرەوە (٤ پێ = ١٢ برگە)

چەمەکان بەرزە پێ هەڵسانو هەلگیرسان (٤ پێ - ١٢ برگە)

ئەسپەکان لە بێشەی ئاگرا ئاودران ( ٤ پێ = ١٢ برگە)

شیکردنەوە:

بە/ هۆر/ەی// ت/فەن/گی// کار/وا/نی// بن/ ب/نار

١ / ٢ / ٣ // ١ / ٢ / ٣ // ١ / ٢ / ٣ // ١ / ٢ / ٣ (١٢ = ٣ + ٣+ ٣+ ٣)

ئەس/تێ/رەی// پش/کۆ/یان

١ / ٢ / ٣ // ١ / ٢ / ٣ (٦ = ٣ + ٣)

ر/ژا/نە// ناو/ چاوی// بە/یانی// بەف/رە/وە

١ / ٢/ ٣// ١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢/ ٣// ١ / ٢/ ٣ (١٢ = ٣ = ٣ + ٣ +٣)

چە/مە/کان// بەر/زە/ پێ// هەڵ/سا/ن‌و// هەڵ/گیر/سان

١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢/ ٣ (١٢ = ٣ = ٣ + ٣ +٣)

ئەس/پە/کان// لە/بێ/شەی// ئا/گ/را// ئاو/د/ران

١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢/ ٣ // ١ / ٢/ ٣// ١ / ٢/ ٣ (١٢ - ٣ = ٣ + ٣ +٣)

بەم جۆرە، ئەم شیعرە دێرەکانی لە نێوان (دوو پێ ٦ برگەو چوار پێ ١٢ برگەدایەو دیرەکانی تری شیعرەکە یەك پێو سێ پێو پێنج پێیشیان تێدایە. لەم جۆرە کێشەدا دەبێ هەموو پێیەکان سێ برگەیی بن، جا شاعیر ئازادە چەند پێ لە دێرێك دینێ.

٢- کێشی ئازادی پێی چوار برگەیی:

لەم جۆرە کێشەدا شاعیر یەك پێی چوار برگەیی وەردەگرێو دەیکا بە بنەمای کێشەکە. لە هەر دێرێکدا یەك پێ، یان چەند پێی چوار برگەیی دینێ. لەم جۆرە شیعرە ئازادەدا ئەم کێشی چوار پێیە لە هەموویان زیاتر بە کار هاتووە. جا ئەگەر لە کێشی ژمارەیی ستوونیدا کێشی دوو پێی پێنج برگەیی (دە برگەیی) کێشی نەتەوایەتی کوردی بێ چونکە لە کێشەکانی دی زیاتر بە کار هاتووە، لە کێشی ئازاددا ئەم چوار برگەییە کێشی نەتەوایەتییە چونکە لەوانی دی زیاتر بە کار هاتووە. بۆ نموونە:

قوبادی جەلی زادە لە شیعری ( سەجادی لە ئامێزی فرمێسكو ئاگردا) دەڵێ:

هاتووم ئارامگەی غەریبیت

گوڵباران کەم

بنووشتێمەوە بە سەرتا وەکوو گومەز

باسکەکانم بکەم بە کێل

شیکردنەوە:

ها/تووم/ ئا/رام//گەی/ غە/ری/بیت

١/ ٢/ ٣/ ٤/ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ (٨ = ٤ +٤ )

گوڵ/با/ران/ کەم

١/ ٢/ ٣/ ٤/ (٤ = ٤)

ب/نووش/تێ/مە//وە/بە/ سەر/تا// وە/کوو/ گو/مەز

١/ ٢/ ٣/ ٤/ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ (١٢ = ٤ + ٤ + ٤ )

باس/کە/کا/نم// ب/کەم/ بە/ کێل

١/ ٢/ ٣/ ٤/ // ١/ ٢/ ٣/ ٤/ (٨ = ٤ +٤ )

دیارە دێرەکان بریتین لە یەك پێی چواری (٤ برگە)و دوو پێی چواری(٨ برگە)و سێ پێی چواریی ( ١٢ برگە).

٣- کێشی ئازادی پێی پێنج برگەیی:

لەم جۆرە کێشەدا، شاعیر پێی پێنج برگەیی دەکا بە بنەمای کێشەکە. واتە پێی پێنجی وەردەگرێ‌و لە هەر دێرێکدا چەند جارێك دووبارەی دەکاتەوە. ئەم کێشە لە کێشەکانی دی کەمتر بە کارهاتووە. لە کێشی ژمارەیی ستوونیدا کێشی دوو پێی پێنجی (دە برگەیی) لە هەموو کێشەکانی دی زیاتر بە کار هاتووە کەچی کێشی پێنج برگەیی لە کێشی ژمارەیی ئازاددا لە هەموو کێشەکانی دی کەمتر بە کار هاتووە.

بۆ نموونە عەبدولا پەشێو لە شیعری (ئەو ساتە خۆشەم هێشتا لە بیرە)دا دەڵێ:

لە تەنیاییدا

لە بەندیخانەی ئەنگوستەچاوا

ڕۆژانی ژینم تێپەڕین بێ دەنگ بێ خواپەرستی

بێ ئیلهام بێ ژین

بێ فرمێسکی گەش بێ خۆشەویستی

شیکردنەوە:

لە/ تەن/یا/یی/دا

١ / ٢/ ٣/ ٤ /٥ (٥ = ٥)

لە/ بەن/دی/خا/نەی// ئەن/گوس/تە/چا/وا

١ / ٢/ ٣/ ٤ / ٥ // ١ / ٢/ ٣/ ٤ /٥ (١٠ = ٥ + ٥)

ڕۆ/ژا/نی/ ژی/نم// تێ/پە/ڕین/ بێ/ دەنگ// بێ/ خوا/پە/رس/تی

١ / ٢/ ٣/ ٤ / ٥ // ١ / ٢/ ٣/ ٤ / ١ / ٢/ ٣/ ٤ / ٥ (١٥ = ٥ + ٥+ ٥)

بێ/ ئیل/هام/بێ/ ژین

١ / ٢/ ٣/ ٤ /٥ (٥ = ٥)

بێ/ فر/مێس/کی/ گەش// بێ/ خۆ/شە/ویس/تی

١ / ٢/ ٣/ ٤ / ٥ // ١ / ٢/ ٣/ ٤ /٥ (١٠ = ٥ + ٥)

ئەم چەند دێرە کێشەکەیان کێشی ئازادی ژمارەیی پێنج برگەییە. شاعیر پێی پێنج برگەیی کردووە بە بنەماو لە هەر دێرێکدا جارێك یان چەند جارێك دوو بارەی کردۆتەوە. کێشی دێرەکان لە نێوان یەك پێیی (٥ برگە)و دوو پێیی (١٠ برگە)و سێ پێیی (١٥برگە)دان.

نموونەی گشتی

کێشی شیعری ئازادی کوردی

ئازاد ئەبم

پاش دڵتەنگی دڵشاد ئەبم

بتپـــــەرســــــت نیــــــم

نـــــــــــابمو نـــیــــــم

کابرایەکی رووتو بـــرسیم

بە هیوای پاشەرۆژ ئــــەژیم (گۆران)

دڵدارەکان

دڵدارانی چاوی وشەی باخی ئاگری هۆنراوە

دڵدارانی گوڵی بارانی وەریوی

درەختی خـــــۆری رووتـــــاوە، (شێرکۆ)

لە یەکەم رۆژی شـەڕی دژوارا

نامەکانی تۆم گشت کۆکردنەوەو گڕم تێبەردان

مـــەبادا دوژمن

وشەی پیرۆزو بەرزی دڵداری

بهاوێتە ژێر پۆستاڵی چڵکن (پەشێو)

سەیرم کەن بە رمی نیوەڕۆی داخکراو لە دەستما

چۆن سەری مردنی ئەم شەوە هەڵئەگرم

سەیرم کەن ئەم جارە بەیداخی

مەرگی خۆم هەڵئەبڕم

مل ئەنێم بە ڕێگەی دۆزەخا بۆ بەهەشت

مل ئەنێم... (شێرکۆ)

ئەگەر هاتی دەستم بگرەو

یەکە یەکە

ئەو باخچانەم پێ بگەڕێ

لە بن هەر دارە ماچێکم پێ ببەخشەو

منیش شیعرێ (قوبادی جەلی زادە)

لای من هەر تۆی

تاقە رووباری داوێن پاك

ئەو رووبارەی خاك لافی پێوە لێ دەدا

ئەو رووبارەی

مرۆڤ چۆکی بۆ دادەدا (نەوزاد رەفعەت)

بەفری هەڵگورد

تۆ بە ڕێژنەو شەستەباران

نەتوێیەوە

تۆ بە تیشکی داغی خۆرو

لوورەی زریان نەتوێیەوە

ئەی چۆن منی سەر ئاسنی

بازوو پۆڵا

دەتوێمەوە (ئازاد دڵزار)

# بەشی پێنجەم

## ســـــەروا

سەروا لەگەڵ کێش دوو رەگەزی شکڵی هـەرە گرنگـی شـیعری کلاسـیکین. بـە هەردووکیان ئاوازی شیعرەکە دابین دەکەن و تەواوکەری یـەکترن. ئـاواز دەورێکـی زۆری هەیە لە گواستنەوەی هەستو سۆزو ماناو مەبەستی شاعیر بۆ گـوێگر. ئـەو ئاوازەیش لە جۆری دەنگەکان و چۆنیەتی ریزبوونیانەوە پەیدا دەبێ.

سەروا چییە؟

سەرروا بریتییە لە دووبارەبوونـەوەی دەنگێـك یـان چـەند دەنگێـك یـان چـەند دەنگوشەیەك لە کۆتایی لەت یان دێرە شیعردا. سەروا بە زۆری لـە کۆتـایی لـەت یان دێرە شیعر دێ بەڵام وایش دەبێ لە نـاوەوە بـێ (سـەروای نـاوەوە) یـان لـە سەرەتاوە بێ (سەروای سەرەتا). سەروا بۆی هەیە لە پەخشانیش بـێ وەکـوو لـە پەخشانی سەرواداردا دەردەکەوێ. نموونە بۆ سەروا وەکوو:

گوتم بە بەختی خەواڵوو بەسی ئەتو بی خودا

لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا (حاجی ٣١)

ئەم دوو لەتەو لەتی کۆتایی هەموو دێرە شیعرەکانی ئـەم هـۆنراوە بەهارییـەی حاجی لە کۆتاییدا یەك دەنگیان هاوبەشە. دەنگی (ا). واتە هەموو دێرەکـان بـەم دەنگە کۆتاییان هاتووە. (شەهلا، سەدا، سەما، تەڵا، گونا، خەتا، بەڕەزا، عەزرا، هەڵدا، مینا، ...) ئەم دەنگە سەروای هۆنراوەیەی پێك هێناوە.

وەکوو چۆن لێرەدا یەك دەنگی بزوێنی درێژ (ا) سەروای دروست کردووە، دەشێ چەند دەنگو وشەیەك سەروا دروست بکەن وەکوو:

چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی مسکین دەکا

مەستە مەیلی چەن کەبابێکی دڵی خوێنین دەکا.(نالی ١١٠)

لەم دوو لەتەو لە لەتی کۆتایی هەموو دێرەکانی تری ئەم هۆنراوەیەی نالیدا، سەروا بریتییە لە (...ین دەکا) چونکە ئەمە لە کۆتایی هەموو دێرەکان دووبارە دەبێتەوە. (چین دەکا، رەنگین دەکا، پەروین دەکا، دین دەکا، شین دەکا، پەرژین دەکا)

دوو باسی گرنگ لە زانستی سەرواسازیدا هەن.

باسی یەکەم– سنووری سەروا

باسی دووەم– دابەشبوونی سەروا

هەر یەکە لەم دووانە بە شێوەی سەربەخۆ باس دەکەین

## باسی یەکەم: سنووری سەروا

دەتوانین لە دوو ئاست لە سنووری سەروا بکۆڵینەوە:

١- لە ئاستی دەنگ

٢- لە ئاستی وشە

١- لە ئاستی دەنگدا، دەنگی سەروا سێ جۆرە:

ئەلف - رەوی: دەنگی کۆتایی وشەی فەرهەنگی سەروایە واتە بێ مۆرفیمی دواوەی، ئەگەر مۆرفیمی پێوە لکا بوو. وەکوو:

هەر سەحەر دێنێتە یادم کۆیی تۆ موڵکی خەتا

نەفحەها دێنێ لە مشکین زولفی تۆ بادی سەبا (سالم ٣٤)

لێرەدا دەنگی وشەی فەرهەنگی سەروا (ا)یەو لە کۆتایی وشەکانی سەروا(خەتا، سەبا) هاتووە. ئەم دەنگ پێی دەگوترێ (رەوی).

تێبینی:

- سەروا دەشێ یەك تاکە دەنگ بێ بە مەرجێ دەنگەکە بزوێنی درێژ بێ.

- بزوێنی کورت بە تەنیا نابێ بە سەروا. ئەگەر لە کۆتایی وشەکانی سەروا بزوێنێکی کورت هاوبەش بوو، بزوێنە کورتەکە هەرچەندە بۆ کێش درێژ دەکرێتەوە (ئیشباع) بەڵام بۆ سەروا هیچ حیسابی بۆ ناکرێ وەك نەبووبێ وایە.

- نەبزوێن ناتوانێ بە تەنیا سەروا دروست بکا . هەر دەبێ بزوێنی پێشەوەیشی لەگەڵدا هاوبەش بێ بۆ ئەوەی بە هەردووکیان سەروا دروست بکەن.

نموونەیەكی تر بۆ (رەوی) وەكوو:

پڕ گوڵەو عەنبەر وەتـەن خاكی وەكوو جـــامی بلوور

پڕ بە چەشمەی ئاوی رۆشن میسلی چاوی پڕ لە نوور (حەمدی ٨٢)

لێرەدا وشەكانی كۆتایی كە وشەی سەروان بریتین لە (بلوور، نـوور). ئـەم دوو وشەیە لە كۆتاییدا لە دەنگەكانی (..وور) هاوبەشـن. دوا دەنـگ بریتییـە لـە (ر). ئەمە رەوییە بەڵام لە بەر ئەەی ئەو دەنگە نەبزوێنە بە تەنیا سەروا دروسـت ناكا هەر دەبێ دەنگی بزوێنـی پێشەوەیشی هاوبـەش بـێ كـە لێـرەدا بزوێنـی (وو)ە. وشەكانی سەروای تری ئەم هۆنراوەیە كە لە كۆتایی دێرەكان دووبارە بوونەتـەوە ئەمانەن: (سوور، دوور، تەنوور، شوور، حوور). دیارە لە هەموو وشـەكاندا لەگـەڵ رەوی (ر)، كـە نەبزوێنـە، دەنگـی پێـشەوە دووبـارە بۆتـەوە كـە دەنگـی بزوێنـی (وو)ە.

ب- پێش رەوی ئەو دەنگە بزوێنـە یـان ئـەو دەنگانەیـە كـە لـە پـێش دەنگـی رەوی دێنو لەگەڵ رەوی بە یەكەوە سەروا دروست دەكەن. بۆ نموونە:

دل ژ عیلاجێ كو ب دەركەت میزاج

دێ ژ لەبی نۆش عەتـا بت عیـــلاج (جزیری ١٧٠)

لیرەدا وشەكانی كۆتایی كە وشەی سـەروان بـریتین لـە (میـزاج، عـیلاج). ئـەم وشانە دەنگی كۆتاییان (ج)ە. ئـەم دەنگـە پێـی دەگـوترێ رەوی. لەبـەر ئـەوەی رەوی لێرەدا دەنگێكی نەبزوێنە دەنگی بزوێنـی پێشەوەیشی بۆتـە هاوبـەش كـە دەنگی (ا) یە بۆ ئەوەی بە هەردووكیان سەروا دروست بكەن. وشـەكانی سـەروای تری ئەم هونراوەیە ئەمانەن: (زوجاج، نەشـاج، عـاج، تـاج، بـاج، رەواج، میـزاج).

دیاره له هەموو وشەکاندا دوو دەنگ له کۆتایی دووباره بۆتەوه (...اج). دەنگی بزوێنی (ا) که له پێش ڕەوی نەبزوێن (ج) هاتووه بۆ ئەوەی سەروای لەگەڵ دروست بکا پێی دەگوترێ (پێش ڕەوی).

ج- پاش ڕەوی: بریتییه له بزوێنی کورتی دوای ڕەوی نەبزوێن یان ئەو مۆرفیمه ڕێزمانیانەی به کۆتایی وشەی سەرواوه دەلکێن. نموونه:

دوێنێ دڵبەرێکم دی کـــه وەك شمشادی بوستـــانه

سوئالم کرد که بۆچی ڕووت ئەڵێی مانگی درەخشانه (ئەحمەد موختار ١٠٤)

لێرەدا وشەکانی سەروا بریتین له (بوستانه، درەخشانه). دوا دەنگی ئەم وشانه دەنگی بزوینی (ە)یه. له بەر ئەوەی ئەم بزوێنه کورته ناتوانێ به تەنیا سەروا دروست بکاو نابێ به ڕەوی، بۆیه له سەرواناسیدا پشت گوێ دەخرێ. لێرەدا دەنگی نەبزوێنی (ن) دەبێ به ڕەوی. دەنگی بزوێنی (ە)، که سەروای پێ دروست ناکرێ، دەبێ به پاش ڕەوی. وشەکانی سەروای تری ئەم هۆنراوەیه ئەمانەن: (تابان/ە، بەستان/ە، جان/ە، ئیمان/ە، پەرێشان/ە، چەوگان/ە، شەیتان/ە، زستان/ە، خووبان/ە). له هەموو وشەکاندا بزوێنی کورتی کۆتایی یەك شته. پاش ڕەوییه.

نموونەیەکی تر بۆ پاش ڕەوی:

درێغا سەعوە ئاسا سەیدی چەنگی شاهبازێکم

زەدەی تیری نیگاهی جادووانەی عیشوەسازێکم (سالم ٨٧)

وشەکانی سەروا بریتین له: (شاهبازێکم، عیشوەسازێکم). هەر یەکه لەم وشانه له وشەیەکی فەرهەنگیو دوو مۆرفیمی ڕێزمانی پێکهاتووه: (شاهباز + ێك + م)

(عیشوەساز + ێك + م). دەنگی کۆتایی وشە فەرهەنگییەکان دەنگی (ز)ە. ئەم دەنگە رەوییە. دەنگەکانی دوو مۆرفیمەکەی دواوە (پاش رەوی)ن کە بریتین لە (...ێك/م). وشەکانی سەروای تری ئەم هۆنراوەیە ئەمانەن: (ئەیاز/ێکم، سەرفراز/ێکم، جانگوداز/ێکم، بەراز/ێکم، نیاز/ێکم، مەجاز/ێکم). لە هەموو وشەکاندا دەنگەکانی مۆرفیمەکانی (...ێکم) لە پاش رەوی (ز) دووبارە بوونەتەوە.

تێبینی:

دەشێ لە سەروا تەنیا رەوی هەبێ یان رەوی‌و پێش رەوی هەبێ یان رەوی‌و پاش رەوی هەبێ یان رەوی‌و پێش رەوی‌و پاش رەوی هەرسێکیان هەبن. واتە دەبێ رەوی هەر هەبێ بەڵام پێش رەوی‌و پاش رەوی دەشێ هەبن‌و دەشێ نەبن. سەروا بە بێ رەوی دروست نابێ. نموونەیەك بۆ هەرسێکیان بە یەکەوە:

گریەو گڕەی تەنوورە بڵێسەی هەناوەکەم

سیروان‌و تانجەڕۆیە خوڕەی ئاوی چاوەکەم (ئەحمەد موختار ٩١)

وشەی سەروای ئەم دوو لەتە دێرە بریتین لە (هەناوەکەم، چاوەکەم). وشە فەرهەنگییەکان بریتین لە (هەناو، چاو). لەم دوو وشەیەدا دوا دەنگی هاوبەش کە دەنگی (و)ی نیمچە بزوێنە، رەوییە. دەنگی بزوێنی پێش ئەم رەوییە (ا) پێش رەوییە، دەنگەکانی مۆرفیمە رێزمانییەکان (...ەکەم) پاش رەوین. وشەکانی سەروای تری ئەم هۆنراوەیە ئەمانەن: (بڵاو/ەکەم، هەڵکراو/ەکەم، ناو/ەکەم، رژاو/ەکەم، براو/ەکەم، کڵاو/ەکەم) .

دەتوانین بەشەکانی دەنگی سەروا بەم هێکارییە پێشان بدەین:

دەنگەکانی سەروا




شیکردنەوەی نموونەیەك:

لە دەس ئەم ئەسپە بۆزە بێ قەرارم

هـــەمیشـــە دڵ غـــــەمین و داغدارم (سالم ٨١)

لەم دوو لەتە شیعرەدا، وشەکانی سەروا بریتین لە (بێ قەرارم، داغدارم). وشە فەرهەنگییەکان ئەمانەن: (قەرار، داغدار).

رەوی: (ر)

پێش رەوی: (ا)

پاش رەوی: (م)

نموونەیەکی تر:

دەستی قودرەت کو هلاڤێت ژ بەژنا تە نیقاب

ل جەمالا جەبەرووتی مە نەمان پەردە حیجاب (جزیری ٦٢)

لەم دوو لەتە شیعرەدا، وشەکانی سەروا بریتین لە (نیقاب، حیجاب).

ڕەوی: (ب)

پێش ڕەوی: (ا)

پاش ڕەوی: نییە.

لەم دێرە شیعرانەدا، دەنگەکانی سەروا (ڕەوی)و (پێش ڕەویو پاش ڕەوی، ئەگەر هەبوون) دیاری بکە:

چێشەن پەشێویم ماتەمیی دڵەن

یا کزەی ئامای نامەی بولبولەن (مەولەوی ١٧٢)

هەر چەن ئەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم

بۆم ناخرێتە ناو چوارچیوەی هەڵبەستم (گۆران ١٢١)

سەیری کەن حەق چۆن بزر بوو چەشنی بەرد کەوتۆتە گۆم

بێ ڕەواجە چەند لە دونیا نەقسە هەر وەك نرخی ڕۆم (عاصی ١٩٥)

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسسەیی شاهن

ئاشووبی دڵی مەملەکەتو قەلبی سییاهن (نالی ٣٤٠)

جانا دڵەکەم بەندە بە حەڵقەی سەری گیسووت

سا مەیخەرە بەر زەربەیی شمشێری دو ئەبرووت (کەمالی ٥٧)

٢- لە ئاستی وشەدا، سەروا سێ بەشە:

ئەلف - وشەی سەروا: ئەو وشانەن کە لە کۆتایی لەت یان دێر دێنو دەنگی کۆتاییان یان چەند دەنگێکی کۆتاییان وەکو یەك وایە. وەکوو:

وەرە بگرە بە یادی چـاوی دلّبـەر پیالّەیی سـەهبا

پەشێو بە هەروەکوو مەجنوون لە هیجری قامەتی لەیلا (ئەحمەد مەختار ٦٠)

لێرەدا دەنگی هاوبەشی کۆتایی (ا)یەو لە کوتایی وشەکانی (سەهبا)و (شەهلا) هاتووە. وشەکانی (سەهبا)و (شەهلا) کە دەنگی کۆتاییان (ا) هاوبەشە پێیان دەگوترێ ( وشەی سەروا). وشەکانی سەروای تری دیرە شیعرەکانی تری ئەم هۆنراوەیە ئەمانەن کە لە کۆتایی دێرەکانەوە هاتوون (مینا، دارا، شەهلا، بەیزا).

ب- پاش سەروا (رەدیف): وشەیەکە یان چەند وشەیەکە لە دوای وشەی سەروادا وەکوو خۆیان، بە هەمان مانا، دووبارە دەبنەوە. وەکوو:

قیامەت هەڵئەسێ بێتو قیامێ کا نیگاری من

زەمـانە تێك ئـەدا نیگـاهی چاوی یاری من (ئەحمەدموختار ٩٩)

لیرەدا وشەی (من) لە پاش وشەکانی سەروا (نیگاری، یاری) وەکوو خۆی بە هەمان مانا دووبارە بۆتەوە. ئەم وشەیە پێی دەگوترێ (پاش سەروا - رەدیف) چونکە لە پاش وشەی سەرواوە دێ. ئەم وشەیە لە دوای وشەی سەروای هەموو دێرەکانی تری ئەم هۆنراوەیە وەکوو خۆی دووبارە بۆتەوە (کەناری من، خوماری من، هەژاری من، مەزاری من، بەهاری من، چاری من، هەناری من، ویقاری من)

پاش سەروا بۆی هەیە وشەیەك بێ یان دەستەواژەیەك بێ یان رستەیەك بێ یان زیاتر لە رستەیەك بێ.

ج – پێش سەروا (حاجیب): وشەیەك یان چەند وشەیەکە وەکوو خۆی بە هەمان مانا لە پێش وشەی سەروا دووبارە دەبێتەوە.وەکوو:

هن کاتبن ئەو هنەك د ئوستاد

هن موتربن ئەو هنەك د جەللاد (خانی ٤٣)

لێرەدا وشەی سەروا بریتییە لە (ئوستاد)و (جەللاد) کە لە دوو دەنگی (اد)ی کۆتایی هاوبەشن. لە پێش هەر یەکە لەم وشانەوە (ئەو هنەك د) وەکوو خۆی دووبارە بۆتەوە. ئەمە پێی دەگوترێ پێش سەروا (حیجاب).

تێبینی:

دەشێ لە سەروا تەنیا وشەی سەروا هەبێ یان وشەی سەرواو پاش سەروا (رەدیف) هەبێ، یان وشەی سەرواو پێش سەروا (حیجاب) هەبێ، یان وشەی سەرواو پێش سەرواوو پاش سەروا هەرسێکیان هەبن. واتە دەبێ وشەی سەروا هەر هەبێ بەڵام ئەوانەی تر دەشێ هەبن‌و دەشێ نەبن. سەروا بە بێ وشەی سەروا دروست نابێ. نموونەیەك بۆ هەرسێکیان بە یەکەوە:

زینهار ژ مەشهەدا کو مەم تێ

ئەلبەتتە ژ مەرقەدا کو ئەم تێ (خانی ١٨٨)

لێرەدا وشەکانی سەروا بریتین لە (مەم، ئەم). دوای ئەم وشانە، لە هەردو نیوە دێردا وشەی (تێ) دووبارە بۆتەوە. ئەم وشەیە پاش سەروایە (رەدیف)ە.

پێش وشـەکانی سـەروایش وشـەی (کـو) دووبـارە بۆتـەوە. ئەمـە پـێش سـەروایە (حاجیب).

دەتوانین بەشەکانی وشەی سەروا بەم هێکارییە پێشان بدەین:

وشەکانی سەروا



پێش سەروا (حاجیب)     وشەی سەروا     پاش سەروا (رەدیف)

شیکردنەوەی نموونەیەک:

یەک ئەسمەرو یـا دوی زەری بوو

یەک حووری یو یا دوی پەری بوو. (خانی ٣٦)

لەم دوو لەتە شبعرەدا، سەروا بریتییە لە (یـا دوی زەری بـوو) (یـا دوی پـەری بوو):

وشەی سەروا: زەری، پەری

پاش سەروا (رەدیف): بوو

پێش سەروا (حاجیب): یا دوی

نموونەیەکی تر:

دڵ هیـلاکی نازتــــە با غەمزە تەدبیری نەکا

هەر دەبێ بمرێ مەگەر خەللاق تەقدیری نەکا (حاجی ٥٣)

لەم دوو لەتە شیعرەدا، سەروا بریتییە لە (تەدبیری نەکا) (تەقدیری نەکا)

وشەی سەروا: تەدبیری، تەقدیری

پاش سەروا (رەدیف): نەکا

پێش سەروا (حاجیب): نییە.

نموونە:

لەم دێرە شیعرانەدا، وشەی سەروا و (پێش سەرواو پاش سەروا، ئەگەر هەبوون) دیاری بکە:

لە خەڵوەتخانەدا هەرگیز خـەیـاڵی دڵروبـا نـاکەم

بە روتبەی خۆم کە فەردی میحنەتم کەس ئاشنا ناکەم (قانیع ١٤٨)

ت نیڤـا ئـاگرێ جـانێ من ئیشەڤ

چییە ئەی دۆست دەرمانێ من ئیشەڤ (پەرتۆ ٢٥٧)

رەها نـاکـا دڵم توڕڕەی خەمی یار

سەری نەبڕن هەتا وەك پەرچەمی یار (سالم ٥٧)

هن مودبیرن ئەو هنەك مودەببەر

هن موقبیلن ئەو هنەك موقەددەر (خانی، ١، ٤٣)

تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا ئەکا

ئیمتیحـانی خۆیـە مەقسوودی لە عەمدا وا ئەکا (نالی ١٠٧)

## باسی دووەم: دابەشبوونی سەروا

مەبەست لە دابەشبوونی سەروا چۆنیەتی دووبارە بوونەوەی سەروایە لە هونەری شیعری جیا جیادا وەکوو غەزەلو قەسیدەو و سێینەو چوارینەو پێنجینەو.... یەکە بە یەکە بە کورتی باسیان دەکەین.

ئەلف –دابەشبوونی سەروا لە غەزەلو قەسیدەدا:

غەزەلو قەسیدە لە رووی دابەشبوونی سەرواوە هەردووکیان وەکوو یەك وان. لە هەردووکیاندا یەکێتی سەروا پەیرەو دەکرێ. لە هەردووکیاندا لەتی یەکەمو دووەمی دێری یەکەم هەوسەروان ئینجا کۆتایی هەموو دێرەکان هەمان سەروایان هەیە. لە قیتعەیشدا پەیرەوی یەکێتی سەروا دەکرێ ئەوەندە هەیە لە قیتعەدا لەتی یەکەمو دووەمی دێری یەکەم هاوسەروا نین. تەنیا کۆتایی دێری یەکەم لەگەڵ کۆتایی دیرەکانی تری قیتعەکەدا سەروایان یەکە.

نموونەیەك بۆ یەکێتی سەروا لە غەزەلدا.

روخم رەنگینی رەنگی روومەتی رەنگینتە بازا

قەدی سەرووم کــــەمانینی قەدی شیرینتە بازا

غەریبو بێکـــــەسو زارو فەقیری خانەدانی تۆ

جگەرسووتاوو ماڵوێرانی زولفی چین چینتە بازا

مەعازەللا کە رەحمێکت بە حاڵی زاری مندا بێ

کــــه ئــاخر بــــەنــــــــدەیی خـــــاکی دەری پێشینته بازا

ئـــەگـــەر خوێنم دەڕێـژی تــــــۆ ئەوە تیغو ئەمیش گەردن

ئـــەگـــەر بنیـــادی پـــەیمـــــان دەســـتی من دامینته بازا

لە چاوانم هەتا کەی قەترە قەترە خوێن دەکەی ئەی دۆست

کــــــوا ئــــەو عــــــەهــــــدو پـــەیمـــانو وەفا کابینته بازا

بـــە نـــــــالی بــــــاوەڕت نــــایێ خــــەیــــاڵت بێـــتو ببیـنـێ

کـــە چـــۆن مـــەشغوولی نـــەغمـــەی گۆشـــەیی ناڵینته بازا.

(نالی ٩٥ — ٩٧)

لەم غەزەلەدا، یـەکێتی سـەروا پـەیڕەو کـراوە. هـەردوو لـەتی دێری یەکـەمو کوتایی هەموو دێرەکانی تر سەروایان وەکوو یەکـە. لـەم غـەزەلـەدا، (بـازا) پـاش سـەروایە (رەدیـف)ە. وشـەکانی سـەروا ئەمانـەن: (رەنگینتــە، شـیرینتە، چـین چینتە، پێشینتە، دامینتە، کابینتە، ناڵینتە). هێڵکاری دابەشبوونی سەروای ئـەم غەزەلە بەم جۆرەیە:

A............. A..............

............A .............. B

............A.............. C

............A.............. D

............A.............. E

F .............. A............

ب – دابەشبوونی سەوا لە مەسنەویدا:

سەروای مەسنەوی یان موزدەوەج ئەوەیە هەر دوو لەتی دێرێك سەروایان یەك بێو پەیوەندیان بە سەروای دێرەکانی ترەوە نەبێ نموونە:

هەژار ئامۆژگاری شێرکۆی کوڕی دەکاتو لە شوێنێکدا دەڵێ:

ئێستەش لە سەر ئەم ژیانە تاڵەش

پاش رشتنی هێندە خوێنە ئاڵەش

کورد هەر لە خەوی نەزانیدایە

هەموو پێکوەیان گەڕو هەرایە

بێگانە پەرستە خۆنەویستە

بۆ هاوڕەگەزی کەڕو نەبیستە

بۆ یەکتری دوژمنو نەیارن

بۆ نۆکەریی تا بڵێی لەبارن (خانی، ١، ٣٦٥)

وەك دیارە، هەردوو لەتی هەردێرێك یەك سەروای سەربەخۆیان هەیە پەیوەندی بە سەروای دێرەکانی ترەوە نییە. دێری یەکەم وشەکانی سەروای ئەمانەن: (تاڵەش، ئاڵەش)، دێری دووەم وشەکانی سەروای ئەمانە: (نەزانیدایە،

هەرایە)، دێری سێیەم وشەکانی سەروای ئەمانە: (خۆنەویستە، نەبیستە)، دێری چوارەم وشەکانی سەروای ئەمانە: (نەیارن، لەبارن).

هێلکاری دابەشبوونی سەروای ئەم چەند دێرە بەم جۆرەیە:

A...............A...............
B...............B...............
C...............C...............
...............D...............D

<u>تێبینی:</u>

– نزیکەی هەر هەموو شیعری زاری گۆران و هەموو داستان شیعرییەکان دابەشبوونی سەروایا بە شێوەی مەسنەوییە.

– مەسنەوی زیانر بۆ شیعری درێژو چیرۆکە شیعر بە کار دێ.

– مەسنەوی وەکوو زاراوە بۆ چیرۆکی شیعری درێژیش بە کارد دێ وەکوو (مەسنەوی مەعنەوی جەلالەدینی رۆمی).

ج – دابەشبوونی سەروا لە سێیینەدا:

سێیینە پارچەیەکە لە سێ لەت پێك دێ. ئەگەر سەربەخۆ بێ پێی دەگوترێ سێیینەو ئەگەر لە ناو هونراوەیەکی دووریژدابێ، هونراوە درێژەکە پێی دەگوترێ سێیینە بەند. واتە لە کۆمەڵێ سێیینە پێك دێ مانایان بە یەکەوە بەسراوە.

نموونە بۆ سێیینە: لە فۆلکلۆردا هاتووە:

چەند ئەستێرەی لە <u>عاسمانێ</u>

هەندەم خەنجەر <u>دادەڕژانێ</u>

یار لەوێ بوو <u>نەمویرانێ</u> (فۆلکلۆر)

